ئایا ئەمە یەك سێوە ؟

ئایا ئەوە یەك منداڵە ؟

ئایا ئەمە یەك پەنجەرەیە ؟

ئایا ئەوە یەك کوڕە؟

بەڵێ ، ئەمە یەك سێوە

بەڵێ ، ئەوە یەك منداڵە

نەخێر ، ئەمە یەك پەنجەرە
نی یە ، ئەمە یەك وێنەیە

نەخێر ، ئەوە یەك کوڕ نی یە
، ئەوە یەك کچە

✺ ✺ ✺ ✺ ✺

ئایا ئەمانە سێون؟

ئایا ئەوانە منداڵن ؟

ئایا ئەمانە پەنجەرەن ؟

ئایا ئەوانە کوڕن ؟

بەڵێ ، ئەمانە سێون

بەڵێ ، ئەوانە منداڵن

نەخێر ، ئەمانە پەنجەرە
نین ئەمانە وێنەن

نەخێر ، ئەوانە کوڕ نین
ئەوانە کچن

ب- ئەم رستانەی لای خوارەوە بخوێنەو سەرنجی وشە سوورەکان بدە .

١- پاساری‌یەکە لەسەر دارەکەدایە.

٢- پشیلەکە لەژێر مێزەکەدایە .

٣- کامەران لە تەنیشت ئەحمەد دانیشتووە .

٤- ماڵمان لە پشتی قوتابخانەکەدایە .

٥- من لە بەردەم هاوڕێکەم ڕاوەستاوم .

٦- ئاسۆ لای مامەی ئیش دەکات .

٧- ئاوات بۆ مۆزەخانە دەڕوات .

٨- مامۆستاکان لە شاری بەسرەدا گەڕانەوە .

٩- زەوی بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە .

١٠- گەلاوێژ لە نێوان کانی و ڤیاندا دانیشتووە .

## وانەی شەشەم

**ئەم ڕستانەی لای خوارەوە بخوێنەو سەرنجی ئەو کردارانە بدەکە تیایاندایە :**

١- ئازاد بۆ قوتابخانە چوو .

٢- شیرین گۆشت دەبرژێنێت .

٣- ئیشەکانم زوو تەواوکرد .

٤- سەوزەفرۆش میوە دەفرۆشێت .

٥- ئاوات پەنجەرەکەی داخست .

٦- ئارام هەمیشە لە کاتژمێری دەدا دەخەوێت .

٧- باڵندەکان پۆل پۆل فڕین .

٨- نەسرین یارمەتی دایکی دەدات .

٩- قوتابیەکان وەڵامی پرسیارەکانیان دایەوە .

١٠- کاسە پڕبوو لێی دەرژێت .

## واتای وشەکانی وانەی پێنجەم و شەشەم

| کوردی | عەرەبی |
|---|---|
| دەست نیشان کردن | إشارة |
| چی یە ؟ | ماذا؟ |
| کردار ، فرمان | فعل |
| چوو | ذهبَ |
| دەبرژێنێت | يشوي |
| تەواوکرد | اكملت ، انهت ، انجزت |
| سەوزە فرۆش | بقال |
| داخست | اغلقَ |
| هەمیشە | دائماً ، ابداً |
| دەخەوێت | ينام |
| فڕی | طار |
| یارمەتی دەدات | تساعد |
| دەڕژێت | يسكب |
| لەسەر | فوق |
| لەژێر | تحت |
| لەتەنیشت | بجانب |
| دانیشتووە | جلس |
| پشت | خلف ، وراء / ظهر |
| بەردەم | امام |
| لەلای | عند |
| بۆ | الى |
| لە | من |
| دەسووڕێتەوە | تدور |
| دەور | حول |

# بەشی ڕێزمان

١- جێناوی کەسی جودا (سەربەخۆ) .

٢- جێناوی کەسی لکاو

٣- ناو لە ڕووی ژمارەوە :
ناوی تاک و ناوی کۆ

٤- ناو لە ڕووی ناسینەوە :
ناوی ناسراوو ناوی نەناسراو .

٥- ئامرازی پرس

٦- دەمەکانی کردار :
١- کرداری ڕابوردوو
٢- کرداری ڕانەبوردوو
٣- کرداری داخوازی

٧- ئاوەڵکردار

**وانەی یەکەم**

# جێناو ( ڕاناو )

## جێناوی کەسی جودا ( سەربەخۆ )

- من کتێبی بەسوود دەخوێنم .
- ئیمەکتێبی بەسوود دەخوێنین .

- تۆ کرێکارێکی دڵسۆزیت .
- ئێوە کرێکارێکی دڵسۆزن .

- ئەو ئەندازیارێکی چالاکە .
- ئەوان ئەندازیارێکی چالاکن .



## ڕاڤەکردن

جێناوی (من) لە ڕستەی ( من کتێبی بەسوود دەخوێنم)دا سەربخۆ دەگوترێتو لەجیاتی ئەو کەسە بەکار هێنراوە کە قسەدەکات (دەدوێت ) .

جێناوی (ئیمە) لە ڕستەی (ئێمە کتێبی بەسوود دەخوێنین )دا سەربەخۆ دەگوترێتو لە جیاتی ئەو کەسانە بەکارهێنراون کە قسەدەکەن (دەدوێن) .

جێناوی (تۆ) لە ڕستەی (تۆ کرێکارێکی دڵسۆزیت )دا سەربەخۆ دەگوترێتو لەجیاتی ئەو کەسە بەکارهێنراوە کە دەدوێنرێت.

جێناوی (ئێوە) لە ڕستەی (ئێوە کرێکارێکی دڵسۆزن)دا سەربەخۆ دەگوترێتو لەجیاتی ئەو کەسانە بەکارهێنراوە کە دەدوێنرێن .

جێناوی (ئەو) لە ڕستەی (ئەو ئەندازیارێکی چالاکە)دا سەربەخۆ دەوترێت و لەجیاتی ئەو کەسە بەکارهێنراوە کە باسی دەکەین (لێی دەدوێین) .

جێناوی (ئەوان) لە ڕستەی (ئەوان ئەندازیارێکی چالاکن)دا سەربەخۆ دەوترێت و لەجیاتی ئەو کەسانە بەکارهێنراوە کە لێیان دەدوێین) .

**پێناسە :**

جێناوی کەسی جودا : ئەو جێناوەیە کە لە ڕستەدا سەربەخۆ دەنووسرێت و دەخوێندرێت .

بۆ زیاتر ڕوونکردنەوە سەیری ئەم خشتەیەی خوارەوە بکە :

| کۆ | تاک | کەس |
|---|---|---|
| ئێمە | من | یەکەم |
| ئێوە | تۆ | دووەم |
| ئەوان | ئەو | سێیەم |

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی لای خوارەوە جێناوی سەربەخۆ دیاری بکە :

١- ئەو گۆڤار دەخوێنێت .

٢- مامۆستاکەی ئێوە بەڕێزە .

٣- من باوکم خۆش دەوێت .

٤- ئەوان حەز لە ماسی دەکەن .

٥- مامۆستاکە بە ئێمەی وت ئافەرین .

٦- کە من ڕۆشتم ئەو هات .

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم بۆشایییانەی لای خوارەوە بە جێناوی (من ، ئێمە) پڕبکەرەوە :

١- ------- پزیشکێکی دڵسۆزین .

٢- ------- کارەکانمان زوو ئەنجام دەدەین .

٣- ------- ڕێز لە باوکم دەگرم .

٤- ------- دەچین بۆ مۆزەخانە .

٥- ------- ئەندازیارێکی زیرەکم .

٦- ------- زوو لە خەو هەڵدەستین .

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم بۆشاییانەی لای خوارەوە بە جێناوی جودای (تۆ ، ئێوە) پڕ بکەرەوە :

١- ---------- دارتاشێکی کارامەیت .

٢- ---------- بۆ شاری بەسرە دەچن .

٣- دایکم وتی ---------- منداڵێکی پاکن .

٤- ---------- خێرا دەنووسن .

٥- ---------- فەرمانبەرێکی ڕەوشت داری .

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم بۆشاییانەی لای خوارەوە بە جێناوی جودای (ئەو ، ئەوان)

پڕبکەرەوە:

١ - ---------- هەمیشە پێدەکەنێت .

٢ - ---------- لەسەر دیوارەکەدا دابەزی .

٣ - ---------- بە پێ بۆ گوند دەچن .

٤ - ---------- منداڵێکی جوانکیلەن .

٥ - لە گەشتو گوزار ---------- گەڕایەوە .

## ڕاهێنانی ( ٥ )

ئەم جێناوە کەسی یە سەربەخۆیانەیەی لای خوارەوە لە ڕستەی بەسوودا بەکاربهێنە :

( ئەوان ، من ، ئەو ، ئێوە ، تۆ )

## واتای وشەکان

| وشە | واتاکەی |
|---|---|
| جێناو ( ڕاناو ) | ضمير |
| جودا ( سەربەخۆ) | منفصل |
| من | أنا |
| تۆ | أنتَ ، انتِ |
| ئەو | هو ، هي |
| ئێمە | نحن |
| ئێوە | أنتم ، أنتن |
| ئەوان | هم ، هنّ |
| ڕاڤەکردن | شرح |
| قسەدەکات(دەدوێت) | يتحدث ، يتكلم |
| دەدوێنرێت | يُحدِّث له |
| لێی دەدوێین | نتحدث عنه |
| لێیان دەدوێین | نتحدث عنهم |
| خشتە | جدول (الرياضيات) |
| کەس | شخص |
| تاك | مفرد |
| کۆ | جمع |
| گۆڤار | مجلة |

| | |
|---|---|
| بەڕێز | محترم |
| بە ئێمەی وت | قال لنا |
| ڕۆشتم | ذهبتُ |
| هات | أتى ، جاء |
| کارەکانمان | أعمالنا |
| ئەنجام بدەین | ننجز ، ننفذ |
| ڕەوشت دار | خلوق |
| دابەزی | نزلَ |
| گوند ، دێ ، ئاوایی | قرية ، ريف |
| جوانکیلە | جميل ، محبوب |
| گەشت وگوزار | سياحة |

# جێناوی کەسی لکاو

- أ -

١ – دەتوانم بڕۆمە دەرەوە ؟

٢ – هەنجیرەکەمان خوارد .

٣ – کاوە پەنجەرەکەی داخست .

٤ – قوتابی یەکان وانەکەیان نووسی .

٥ – کراسەکەت تۆزێك درێژە .

٦ – کەی قوتابخانەکەتان دەکرێتەوە .

**تێبینی :**

ئەم جۆرە جێناوە لکاوانە ( م ، مان / ت ، تان / ی ، یان ) لەگەڵ کاری ڕابوردووی تێپەڕ بەکاردەهێنرێن .

**ڕاڤەکردن :**

جێناوی لکاوی (م) لە ڕستەی (دەتوانم بڕۆمە دەرەوە)دا لەجیاتی کەسێك بەکارهاتووە کە قسەدەکات (دەدوێ) .

جێناوی لکاوی (مان) لە ڕستەی (هەنجیرەکەمان خوارد)دا لەجیاتی کەسانێك بەکارهاتوو کە دەدوێن ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە نابێژرێت تەنها لەگەڵ وشەیەکی تردا نەبێت ، پێی دەوترێت (جێناوی لکاو) .

جێناوی لکاوی (ی) لە ڕستەی ( کاوە پەنجەرەکەی داخست)دا لەجیاتی ئەو کەسە بەکارهێنراوە کە لێی دەدوێین بەڵام لەبەر ئەوەی کە سەربەخۆ نابێژرێت دەخرێتە پاڵ وشەیەکی ترەوە ، پێی دەگوترێت (جێناوی لکاو) .

جێناوی لکاوی (یان) لە ڕستەی (قوتابی یەکان وانەکەیان نووسی)دا بۆ ئەو کەسانە بەکارهاتووە کە لێیان دەدوێین لەبەر ئەوەی کە سەربەخۆ نابێژرێت دەخرێتە سەر وشەیەکی تر ، پێی دەوترێت (جێناوی لکاو) .

جێناوی لکاوی (ت) لە ڕستەی (کراسەکەت تۆزێك درێژە)دا لەجیاتی ئەو کەسە بەکارهێنراوە دەدوێنرێت بەڵام لەبەر ئەوەی بەتەنها نابێژرێت دەخرێتە پاڵ وشەیەکی ترەوە ، پێی دەوترێت (جێناوی لکاو) .

جێناوی لکاوی (تان) لە ڕستەی ( کەی قوتابخانەکەتان دەکرێتەوە )دا لەجیاتی ئەو کەسانە بەکارهێنراوە دەدوێنرێن لەبەر ئەوەی کە سەربەخۆ نابێژرێت دەخرێتە پاڵ وشەیەکی ترەوە ، پێی دەوترێت (جێناوی لکاو) .

ئەم خشتەیەی لای خوارەوە ئەوە ڕوون دەکاتەوە:

| کەس | تاك | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | م | مان |
| دووەم | ت | تان |
| سێیەم | ی | یان |

# جێناوی کەسی لکاو

## - ب -

١ـ من دەچم .

٢ ـ ئێمە دەچین .

٣ ـ تۆ دەچیت .

٤ ـ ئێوە دەچن .

٥ ـ ئەو دەچێت .

٦ ـ ئەوان دەچن .

**تێبینی :** ئەم جۆرە جێناوە لکاوانە لەگەڵ کاری ڕانەبوردووی تێنەپەڕو تێپەڕ و کاری ڕابوردووی تێنەپەڕ بەکاردەهێنرێن .

**ڕاڤەکردن :**

ئەگەر سەیری ڕستەکانی سەرەوە بکەین دەبینین جۆرێکی تری جێناوی لکاون ، لە زمانی کوردیدا کە بۆ کەسی یەکەم و دووەم و سێ یەمی تاک و کۆ بەکاردەهێنرێن ، سەرنجی خشتەکەی لای خوارەوە بدە :

| کەس | تاک | کۆ |
|---|---|---|
| یەکەم | م | ین |
| دووەم | یت | ن |
| سێیەم | ێت ، ات | ن |

**دەستوور :**

جێناوی لکاو : ئەو جێناوەیە ، ئەگەر نەخرێتە پاڵ وشەیەکی ترەوە ناتوانرێت بە تەنیا بگوترێت و لەجیاتی کەسی یەکەم و دووەم و سێ یەمی تاك و کۆ بەکاردەهێنرێن ، لە جیای کەسێك یان شتێك بەکاردەهێنرێن کە بدوێت یا بدوێنرێت یا لێی بدوێین .



## ڕاهێنانی (١)

ئەمانەی لای خوارەوە بە جێناوی لکاوی ( م ، مان ) تەواوبکە :

١ – بە سواری پاس بۆ بازاڕ ڕۆشت ------- .

٢ – ئاواز وتی دایە مانگاکە ------- دۆشی .

٣ – خێزانەکە ------- لە شاری سەماوە گەڕانەوە .

٤ – پەروین وتی من و نازەنین نان ------- خوارد .

٥ – من زوو لە خەو هەستا ------- .

## ڕاهێنانی (٢)

ئەمانەی لای خوارەوە بە جێناوی لکاوی ( ت ، تان ) تەواوبکە :

١ – تۆ کلاوەکە ------ ڕەنگی شین.

٢ – ئێوە وانەکە ------ لەبەر کرد .

٣ – ئەحمەدی هاوسێ ------ پزیشکە یان ئەندازیار.

٤ – براکانم کەی باخچەکە ------ خاوێن کردەوە ؟

٥ – تۆ زانی ------ ئەو چی دەڵێت ؟

## ڕاهێنانی (٣)

ئەمانەی لای خوارەوە بە جێناوی لکاوی ( ی ، یان ) تەواوبکە :

١- بازرگانەکان پارەکانـ------ کۆکردەوە .

٢- کامەران ئەسپەکە------- شۆرد .

٣- پەری قژ------ داهێنا .

٤- سەربازەکان پشوو----- وەرگرت .

٥- منداڵەکە------ نەسرین شیر دەخوات .

## ڕاهێنانی (٤)

ئەمانەی لای خوارەوە بە جێناوی لکاوی ( ن ، ین ، ت ، ێت )

تەواوبکە :

١ - لە وەرزی هاویندا جاسم بۆ شەقلاوە دەچـ----- .

٢ - برا بچکۆلەکەم دەڵێت بچـ----- بۆ مزگەوت ؟

٣ - ئازاد وتی کەی بچـ----- بۆماڵیان ؟

٤ - ئێوە بۆ کام لا دەچـ----- ؟

٥ - دایکم دەڵێت کچەکانم ئێستا مەچـ----- .

## ڕاهێنانی (٥)

( أ )  هات

( ب )  هاتم  هاتین

هاتیت  هاتن

هات  هاتن

تۆش ئەم کردارانە وەك وێنەی (ب) لێ بکە  ( گەیشت ، کەوت ، بوو )

## ڕاهێنانی (٦)

لەم جێناوە لکاوانەی خوارەوە ڕستەی بەسوود پێك بهێنە :

( تان ، ین ، ی ، ێت )

## واتـای وشەکان

| کوردی | عەرەبی |
| --- | --- |
| جێناوی لکاو | ضمير متصل |
| دەتوانم | استطيع |
| تۆزێك | قليلاً |
| تەنها | فقط |
| نابێژرێت | لا يقال |
| پاڵ | جنب |
| لەپاڵ | بجانب |

# وانەی سێیەم

## (ناو لە ڕووی ژمارەوە)

(أ) ناوی تاکو ناوی کۆ

| ناوی تاک (أ) | ناوی کۆ (ب) |
|---|---|
| شار | شاران |
| شاخ | شاخان |
| برادەر | برادەران |
| گەڵا | گەڵایان |
| چەقۆ | چەقۆیان |
| دێ | دێیان |
| کانی | کانییان |
| پەنجەرە | پەنجەران |
| بەڕوو | بەڕووان |
| پەموو | پەمووان |



**ڕاڤە :**

ئەگەر سەرنج بدەینە وشەکانی (شار ، شاخ ، برادەر ، گەڵا ، چەقۆ ، دێ ، کانی ، پەنجەرە ، بەڕوو ، پەموو) کە لە کۆمەڵەی (أ)دا هەن هەموویان ناونو هەریەکەیان تاکێك پیشان دەدات بۆیە پێی دەوترێت (ناوی تاك) بەڵام ئەگەر سەرنج بدەینە وشەکانی کۆمەڵەی (ب)کە بریتین لە (شاران شاخان ،برادەران ، گەڵایان ،چەقۆیان ، دێیان ، کانییان ، پەنجەران ، بەڕووان





پەمووان) هەریەکەیان تاکێك پیشان دەدەات بۆیە پێیان دەوترێت (ناوی کۆ)

١ـ لە زمانی کوردیدا نیشانەی کۆ بریتییە لە (ا ن) کە هەمیشە دەکەوێتە کۆتایی ئەو وشەیەی کە دەمانەوێت کۆی بکەینەوە ، ئەگەر هاتوو دوا پیتی وشەکە بە پیتی نەبزوێن کۆتایی پێ هاتبێت ئەوا نیشانەی کۆی (ان)ی بۆ زیاددەکەین واتە بەبێ گۆڕان دەخرێتە سەری بۆ نموونە :

شار ـ شاران ، شاخ ـ شاخان

٢-ئەگەر ناوی تاك کۆتایی بە پیتی بزوێن هاتبێت ئەوا دیسان بەهۆی نیشانەی ( ان )ەوە بە یاریدەی پیتی ( ی ) دەکرێت بە ناوی کۆ وەك :

گەڵا – گەڵایان
چەقۆ – چەقۆیان
دێ – دێیان
کانی – کانییان

٣-ئەگەر ناوی تاك بە پیتی بزوێنی (ە) هاتبێت ئەوا بزوێنەکە لادەبرێتو بەهۆی نیشانەی ( ان )ەوە دەکرێت بە ناوێکی کۆ وەك :

پەنجەرە– پەنجەران
تەختە – تەختان

٤-ئەگەر ناوی تاك بە پیتی بزوێنی (وو) کۆتایی هاتبێت ئەوا دیسان ناوە تاکەکە بەهۆی نیشانەی ( ان )ەوە دەکرێت بە ناوی کۆ وەك :

پەموو - پەمووان

بەڕوو - بەڕووان



**دەستوور**

**١- ناوی تاك :** بەو ناوانە دەوترێت کە بۆ تاکەکەسێك یان بۆ تاکە شتێك بەکاردێت .

**٢-ناوی کۆ :** بەو ناوانە دەوترێت کە بۆ کۆمەڵە کەسێك یان کۆمەڵە شتێك بەکاردێن کە لە دوو شت یان دوو کەس زیاتر بێت.

## ڕاهێنانی (١)

ئەم ناوە تاکانەی خوارەوە بکە بە ناوی کۆ :

شێر ، کیژ ، ژن ، پرد ، پیاو

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ناوە کۆیانەی خوارەوە بکە بە ناوی تاك :

ئەستێران ، سێوان ، هەرمێیان

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم ناوانەی لای خوارەوە لە ڕستەدا بەکاربهێنە :

ئافرەتان ، گەنج ، قوتابیان ، کرێکار

## ڕاهێنانی (٤)

ئەم ناوە تاکانەی خوارەوە بکە بە ناوی کۆ :

ماسی ، جۆ ، مامۆستا ، دەرگا ، شارەزا

# وانەی چوارەم

## ناو لە ڕووی ناسینەوە

### ناوی نەناسراوو ناوی ناسراو

| زنجیرە | ناوی نەناسراو | ناوی ناسراو |
|---|---|---|
| ١ | کوڕ | کوڕەکە |
| | داس | داسەکە |
| | ماڵ | ماڵەکە |
| ٢ | چرا | چراکە |
| | ترێ | ترێکە |
| | هەڵۆ | هەڵۆکە |
| | پەردە | پەردەکە |
| ٣ | پەموو | پەمووەکە |
| | قەیسی | قەیسییەکە |



**خستنەڕوو :**

خوێندکاری خۆشەویست :

١- ئەگەر بە وردی سەرنجی وشەکانی دەستەڕاست بدەیت کە لە کۆمەڵەی ژمارە (١)دا تۆمارکراون ، بریتین لە ناوی نەناسراو ، ئەم ناوانە بەهۆی





نیشانەی ( ـ ەکە) کراون بە ناوی ناسراو وەك :

( کوڕ ←کوڕەکە ، داس← داسەکە ، ماڵ ← ماڵەکە ) .

٢- وشەی (چرا ، ترێ ، هەڵۆ ، پەردە) ناوی نەناسراون کە لە کۆمەڵەی ژمارە (٢)دا تۆمارکراون دەبینین کۆتایی ناوەکان بە دەنگەکانی (ا ، ێ ، ۆ ، ە) هاتووە بەهۆی نیشانەی (ـ کە) کراوە بە ناوی ناسراو وەك :

پەموو ←پەمووەکە ، قەیسی← قەیسییەکە،
ترازوو ← ترازووەکە ، کانی ← کانییەکە

٣- لە کۆمەڵەی ژمارە (٣)دا وشەکانی (پەموو ، قەیسی ) ناوی نەناسراون ، کۆتاییان بە دەنگەکانی ( وو ، ی ) هاتووە ، هەر ناوێکیش وا بێت وەك ناوەکانی ژمارە ( ) بە نیشانەی ( ـ ەکە) دەکرێت بە ناوی ناسراو وەك :

( چرا ← چراکە ، ترێ ← ترێکە ،
هەڵۆ ← هەڵۆکە ، پەردە ← پەردەکە )

**دەستوور**

**١- ناوی نەناسراو :** ئەو ناوەیە کە بۆ تاکێك و بۆ هەموو هاوچەشنەکانی ئەو ناوە بەکاردێت و ناوی کەسێك یان شتێکی دیاری کراوە ناسراو دەردەخات .

**٢- ناوی ناسراو :** ئەو ناوەیە کە لە ناو هاوچەشنەکانی خۆیدا بە ئاسانی جیادەکرێتەوە چونکە ناوێکی دیاری کراوی زانراو دەردەخات .

## ڕاهێنانی (١)

ئەم ناوە نەناسراوانەی لای خوارەوە بکە بە ناوی ناسراو :

مریشك ، نان ، ماسی ، چەقۆ ، ڕێوی ، دەزوو

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ناوە ناسراوانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە :

چیرۆکەکە ، کاوڕەکە ، چەترەکە ، دەرگاکە ، پزیشکەکە

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم ناوە نەناسراوانەی لای خوارەوە لە ڕستەدا بەکاربهێنە :

هەنار ، شاخ ، دەرگا ، دەوری ، دێ

# واتای وشەکان

| وشە | واتاکەی |
| --- | --- |
| کۆمەڵ | مجموعة |
| داس | منجل |
| چرا | فانوس |
| هەڵۆ | عقاب ( طير العقاب ) |
| پەموو | قطن |
| قەیسی ، زەردەلوو | مشمش |
| تۆمارکردن | تسجيل ، تدوين |
| بریتی‌یە لە | عبارة عن |
| دەزوو | خيط |
| هاوچەشن ، هاوشێوە | متشابة |
| زانراو | معروف، معلوم |

# وانەی پێنجەم

## ئامرازی پرس

ئایا بە کوردی باش دەدوێیت (قسە دەکەی) ؟

کەی هەنجیر پێدەگات ؟

کێ وانەکەی خوێندەوە ؟

لە کوێ بوویت ؟

کام قوتابی زیرەکە ؟

کتێبەکە کوا ؟

هەورامان بە چی بەناوبانگە ؟

چۆن هاتیت ؟

چەند پارێزگا لە عیراقدا هەیە ؟

**خستنەڕوو :**

**ئایا :** بۆ چەمکی (مەفهومی) ڕستەکە پرسیاری پێ دەکرێت .

**کەی:** بۆ کاتێك پرسیاری پێ دەکرێت .

**کێ :** دەربارەی کەسێك پرسیاری پێ دەکرێت .

**کوێ:** بۆ شوێنێك پرسیاری پێ دەکرێت .

**کام :** بۆ دەستنیشانکردنی نێوان دوو کەس یان دوو شت یان زیاتر پرسیاری پێ دەکرێت .

**کوا :** بۆ شوێن پرسیاری پێ دەکرێت .

**چۆن:** بۆ چۆنێتیو هەواڵ پرسیاری پێ دەکرێت .

**چی (چ):** بۆ شتێك پرسیاری پێ دەکرێت .

**چەند:** دەربارەی ژمارەو ئەندازەیەك پرسیاری پێ دەکرێت .

## ڕاهێنانی (١)

ئەم بۆشاییانەی لای خوارەوە بە وشەیەکی پرس پڕبکەرەوە :

١- ...........ئەمامەکەی لە باخەکەدا ناشت ؟

٢- تۆ..........هاتیت ؟

٣- ئەوان.........چوون ؟

٤- ...........کتێبت خوێندەوە ؟

٥- بە.........دەڕۆیت بۆ فەرمانگە ؟

٦- لە............ساڵێك لەدایك بوویت ؟

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ئامرازە پرسانەی لای خوارەوە لە ڕستەدا بەکاربهێنە :

( ئایا ، چۆن ، چەند ، کام ، کوێ ، چی )

## ڕاهێنانی (٣)

ئەو وشانەی کە هێڵیان بە ژێردا هاتووە، ئامرازی پرسیاریان لە جێدا دابنێ :

١- خورما لە پارێزگای بەسرەدا زۆرە .

٢- گەنم لە هاویندا پێدەگات .

٣- ئێوە بە پێنووس دەنووسن .

٤- کرێکار زوو لە خەو هەڵدەستێت .

٥- حەفتەیەك حەوت ڕۆژە .

## واتای وشەکان

| وشە | واتاکەی |
| --- | --- |
| خستنەڕوو | عرض |
| دەستنیشان کردن | تحدید |
| نێوان | بین |
| چۆنیەتی | کیفیة |
| ناشتن ، چاندن | غرس ، زرع |
| دەسوورێتەوە | یدور |
| هێڵ | خط |
| پێدەگات | ینضج |
| هەڵدەستێت | ینهض ، یستیقظ ، یقوم |
| فەرمانگە | دائرة |
| لەدایکبوون | ولادة |

## وانەی شەشەم

### دەمەکانی کردار (ازمنە الافعال)
### کرداری ڕابوردوو

١- کامەران ئەسپەکەی فرۆشت .

٢- کامەران ئەسپەکەی فرۆشتووە .

٣- کامەران ئەسپەکەی فرۆشتبوو .

٤- کامەران ئەسپەکەی دەفرۆشت .

**ڕاڤەکردن :**

ئەگەر بەوردی سەیری ڕستەکانی لای سەرەوە بکەین دەبینین وشەکانی ( فرۆشت ، فرۆشتووە ، فرۆشتبوو ، دەفرۆشێت ) هەموویان وشەی بنچینەیین‌و لە پێش ئاخاوتندا ڕوویان داوە ، بۆیە پێیان دەوترێت کرداری ڕابووردوو .

**جۆرەکانی کرداری ڕابوردوو :**

**١- کرداری ڕابوردووی نزیک (سادە) :**

کرداری ڕابوردووی نزیک : بریتی‌یە لە کردارێکی سادە ڕووداوێك لە کاتی نزیکدا پیشان دەدات کە لە پێش ئاخاوتنی قسەکەر ڕووی‌داوەو کاریگەری‌یەکەی نەماوەو هیچ پێشگرو پاشگرێشی وەرنەگرتووە وەك :

چاوگ – ن = ڕابوردووی نزیک

چوون – ن = چوو

بردن – ن = برد

## ٢-کرداری ڕابوردووی تەواو :

کردارێکە پێش قسـەکەر ڕووی‌داوە ، بەڵام کـاریـگەریـیەکەی تـا کاتێکی ئاخاوتن بەردەوامەو نە زۆر دوورو نەزۆر نزیک :

ڕابوردووی نزیک + پاشگری (ووە / وە ) = ڕابوردووی تەواو

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| فرۆشت | + | ووە | = | فرۆشتووە |
| ڕۆشت | + | ووە | = | ڕۆشتووە |
| برژا | + | وە | = | برژاوە |
| خورا | + | وە | = | خوراوە |

## ٣-کرداری دوور :

ئەو کردارەیە کە ڕوودانی کاتێك لە ڕابوردووی دووردا نیشان دەدات.

ڕابوردووی نزیك + بوو = ڕابوردووی دوور

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| کەوت | + | بوو | = | کەوتبوو |
| خەوت | + | بوو | = | خەوتبوو |
| شکا | + | بوو | = | شکابوو |

## ٤-کرداری ڕابوردووی بەردەوام :

ئـەو کـردارەیـە کـە ڕوودانو بـەردەوامـی کـاتـێك لە کاتی رابوردوودا نیشان دەدات :

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| **دە (نە)** | **+** | **ڕابوردووی نزیك** | **=** | **ڕابوردووی بەردەوام** |
| دە | + | چوو | = | دەچوو |
| دە | + | فرۆشت | = | دەفرۆشت |
| دە | + | کەوت | = | دەکەوت |



**دەستوور**

**١- کرداری ڕابوردوو:** کردارێکە دراوەتە پاڵ کەسێك یان شتێك کە لە کاتی ڕابوردوودا کارەکە بەسەر چووەو ڕوویداوە .

**٢-کرداری ڕابوردوو چوار جۆرە :**

١- نزیك (سادە)

٢- تەواو

٣- دوور

٤- بەردەوام

## ڕاهێنانی (١)

ڕسته بۆ ئەمانەی لای خوارەوە پێکبهێنە :

١- ڕابوردووی نزیک .

٢- ڕابوردووی تەواو .

٣- ڕابوردووی بەردەوام .

٤- ڕابوردووی دوور .

## ڕاهێنانی (٢)

لەم ڕستانەی لای خوارەوەدا کرداری ڕابوردوو دیاری بکەو جۆرەکانیشی بنووسە :

١- منداڵەکە سێوەکەی خوارد .

٢- بەڕێز لە چێشتخانەکەدا کەبابی دەخوارد .

٣- ئاسنگەرەکە پەنجەرەکەی چاک کردووە .

٤- کە من چووم ئەو نووستبوو .

٥- من شاری کەربەلام بینیوە .

## ڕاهێنانی (٣)

أ ـ سووتا

ب ـ سووتاوە ، سووتابوو ، دەسووتا

تۆش ئەم کردارانەی لای خوارەوە وەك نموونەی (ب) لێ بکە :

مرد ، برژا ، دڕی ، فڕی

## ڕاهێنانی (٤)

أ ـ هێنا ، هێناوە ، هێنابوو ، دەهێنا .

ب ـ نەهێنا ، نەهێناوە ، نەهێنابوو ، نەدەهێنا

تۆش ئەم کردارە ڕابوردووانە وەك نموونەی (ب) لیّ بکە :

مرد ، هەڵهات ، فڕی ، خلیسکا

## ڕاهێنانی (٥)

لەم کردارە ڕابوردووانەی لای خوارەوە ڕستە درووستبکە :

چاند ، سەرکەوتووە ، داگیرسابوو ، سڕیبوو ، نارد

وانەی حەوتەم

# کرداری ڕانەبوردوو

١- کتێبەکانم ئامادە دەکەم.

٢- وا کتێبەکانم ئامادە دەکەم.

٣- ئێستا کتێبەکانم ئامادە دەکەم.

٤- بەیانی کتێبەکانم ئامادە دەکەم.

## ڕاڤەکردن :

ئەگەر بە وردی سەیری ڕستەکانی لای سەرەوە بکەین، دەبینین هەریەکە لە کردارەکان ئەنجامی کارێك لە کاتی ئاخاوتندا یان لە پاش ئاخاوتندا نیشان دەدات (واتە ئێستا یان لەداهاتوودا ڕوودەدات).

لە ڕستەی ژمارە یەکدا کرداری ئامادەدەکەم وشەیەکی بنچینەییە لە ڕستەکەدا، کردارێك نیشان دەدات کە لە کاتی ئاخاوتندا یان لە دوای ئاخاوتندا ڕوودەدات، لەبەر ئەوە پێی دەوترێت کرداری ڕانەبوردوو. بەڵام لە ڕستەی ژمارە دوویشدا کرداری (ئامادە دەکەم) کاتێك نیشان دەدات کە لە کاتی قسەکردنا ڕوودەدات بە بەکارهێنانی ئاوەڵکرداری کاتی (وا، ئێستا) کاتی ڕانەبوردووی کردارەکە دەستنیشانو ئاشکرا دەکات.

لە زمانی کوردیدا بۆ سازکردنی کرداری ڕانەبوردوو پەنادەبرێتە بە (ڕەگی ڕانەبووردوو)و مۆرفۆمی ئەرێیی ڕانەبوردوویش دەکەوێتە پێش ڕەگەکەو جێناوی لکاویش بە کردارەکەوە دەنووسێت ، بەم شێوەیەی لای خوارەوە :

مۆرفۆمی ئەرێ (دە) + ڕەگی ڕانەبوردوو+ جێناوی لکاو

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| خواردن | ← | دە | + | خۆ | + | م | = | دەخۆم |
| شوشتن | ← | دە | + | شو | + | ات | = | دەشوات |
| شکان | ← | دە | + | شکێ | + | م | = | دەشکێم |

لە ڕستەی چوارەمدا کرداری (ئامادە دەکەم) کردارێك نیشان دەدات ، کە پاش ئاخاوتندا ڕوودەدات بە بەکارهێنانی ئاوەڵکرداری کاتی (بەیانی) کاتی داهاتووی کردارەکە دەخاتەڕوو و ئاشکرای دەکات لەبەر ئەوە پێی دەوترێت کرداری ڕانەبوردوو .

**دەستوور :**

**١- کرداری ڕانەبوردوو :** کارێکە کە لە دوای ئاخاوتندا ڕوودەدات ، واتا لە کاتی ئێستا یان داهاتوودا ئەنجام دەدرێت .

**تێبینی :**

بۆ نەرێ کردنی کرداری ڕانەبوردوو ، مۆرفۆمی (نا) دەچێتە شوێنی (دە)و دەیکا بە نەرێ وەك:

دەچم ← ناچم

بەیانی ← دەچم بۆ بازار

بەیانی ← ناچم بۆ بازار

## ڕاهێنانی (١)

کرداری ڕانەبوردوو لەم ڕستانەی لای خوارەوە دەربهێنە :

١- دەچم بۆ بەسرە .

٢- ڕەوەند بە کەوچك نان دەخوات .

٣- لە پشووی هاویندا لە مەلەوانگە مەلەدەکەم .

٤- لە زستاندا باران زۆر دەبارێت .

٥- لە کتێبخانەدا کتێب دەکرم .

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم کردارە ڕانەبوردووانە لە ڕستەدا بەکاربهێنە :

دەتاشێت ، دادەگرسێنم ، دەنووسمەوە ،
دەگەڕێتەوە ، دروستدەکەن

## ڕاهێنانی (٣)

ئەمانەی لای خوارەوە لەگەڵ کرداری ڕانەبوردوودا لە ڕستەدا بەکاربهێنە :

(دارتاش ، گەشتیارەکان ، بازاڕ ، ئێستا ، وا)

# واتای وشەکان

| وشە | واتاکەی |
|---|---|
| ڕانەبوردوو | مضارع |
| ئامادەکردن | تحضير ، اعداد |
| ڕەگ | جذر |
| شوشتن | غسلْ |
| شکاندن | كسرْ |
| بەیانی | غداً |
| داهاتوو | المستقبل |
| کەوچك | ملعقة |
| مەلەوانگە | مسبح |
| مەلەدەکەم | أسبحْ |
| دادەگرسێنم | أوقد |
| دەگەڕێتەوە | يعود |
| بازاڕ | سوق |

## وانەی هەشتەم

### کرداری داخوازی ( فەرمان )

١- دەمووچاوت باش بشۆرە .

٢- یارمەتی هەژار بدە .

٣- قوتابیان گوێ بگرن .

٤- شیرین دەرگاکە دابخە .

**ڕاڤەکردن :**

أ ـ لە ڕستەی یەکەمدا وشەی ( بشۆرە ) کردارێکە لە پاش فەرمانی شۆردنی دەمووچاوی پێدەکرێت .

ب ـ لە ڕستەی دووەمدا وشەی ( بدە ) کردارێکە لە پاش ئاخاوتن فەرمانی یارمەتی‌دانی هەژاری پێدەکرێت .

جـ ـ لە ڕستەی سێیەمدا وشەی ( گوێ بگرن ) کردارێکە لە پاش ئاخاوتن فەرمانی گوێگرتنی پێدەکرێت .

حـ ـ لە ڕستەی چوارەمدا وشەی (دابخە ) کردارێکە لە پاش ئاخاوتن فەرمانی داخستنی پێدەکرێت .

**دەستوور :**

**کرداری داخوازی :** کردارێکە کە بگۆ (قسەکەر) داوا لە گوێگر (بژنەو) دەکات پاش ئاخاوتن کارێك ئەنجام بدات تاك بن یان کۆ .

## ڕاهێنانی (١)

کرداره داخوازییەکانی ئەم ڕستانەی لای خوارەوە دیاری بکە :

١- ئەحمەد باش بخوێنە .

٢- چرای پۆلەکان بکوژێنەوە .

٣- ئاوی گوڵەکان بدە .

٤- تکایە پەنجەرەکە دابخە.

٥- پاش پشوودان وانەکانت بنووسە .

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم بۆشاییانەی لای خوارەوە بەکرداری داخوازی پڕبکەرەوە :

١- تۆ یارمەتیی باوکت .......... .

٢- کتێبەکانت لە جێگای خۆیاندا .......... .

٣- لای سەرتاشخانە باش ............ .

٤- لە جێگای خۆت .......... .

٥- گۆڤارەکە بە ووردی ....... .

## ڕاهێنانی (٣)

ئەم کردارە ڕابوردووانەی لای خوارەوە بکە بە کرداری ڕانەبوردوو پاشان داخوازی :

ڕاوەستا ، خوارد ، کێڵا ، کڕی ، فرۆشت

## ڕاهێنانی (٤)

أ ـ بنووسە

ب ـ مەنووسە

تۆش ئەم کردارە داخوازییانە وەك نموونەی (ب) بکە بەکرداری نەرێ :

بکڕە ، بڕۆ ، بگرە ، بڵێ ، ڕابکە

## وانەی نۆیەم

### (ئاوەڵکردار)

### ئاوەڵکرداری کاتی و ئاوەڵکرداری شوێنی

( أ )

١- ئێستا بۆ زانکۆ دەچم .

٢- ئەمڕۆ گەلی عیراق بە ئازادی دەژی .

٣- دوێنێ باران باری .

٤- مانگێکی تر باوکم لە خانەقین دەگەڕێتەوە .

( ب )

١- شیلان لە ژێر دارەکە خەوتووە .

٢- لای پیاوی درۆزن دامەنیشە .

٣- لە بەردەم باوکت قسە مەکە .

٤- ماسی یەکەمان لە ناو گۆمەکەدا گرت .

**ڕاڤەکردن :**

١- ئەگەر بە وردی سەرنجی ڕستەکانی لقی ( أ ) بدەین ، ئاوڵکرداری (ئێستا، ئەمڕۆ ، دوێنێ ، مانگێکی‌تر ) هەر یەکەیان ڕوودانی کرداری ڕستەکانیان دەستنیشان دەکەنو سنوورێك بۆ وتاری فرمانەکان دادەنێنو دەبنە

تەواوکەری کردارەکان ، جا بەو بەشەی کە کاتی ڕوودانی کردارەکانی ڕستە دەردەخاتو واتاکەیشی تەواودەکات دەگوترێت ئاوەڵکرداری کاتی .

٢- لە ڕستەکانی لقی (ب)دا ، ئاوەڵکرداری (لە ژێر ، لا ، بەردەم ، لە ناو) هەر یەکەیان لە جێگەی خۆیاندا ڕوودانی کرداری ڕستەکانیان دەستنیشان دەکەنو سنوورێك بۆ واتای کردارەکانیش دادەنێنو لەم ڕووەوە دەبنە تەواوکەری کردارەکان . جا بەو بەشەی شوێنی ڕوودانی کرداری ڕستەکە دەردەخاتو واتاکەیشی تەواودەکات دەگوترێت (ئاوڵکرداری شوێنی) .

**( دەستوور )**

**١- ئاوەڵکرداری کاتی:** بەو ئاوڵکردارانە دەگوترێت کە کاتی ڕوودانی کرداری ڕستەکە دەستنیشان دەکاتو واتاکەیشی تەواودەکات .
ئەمانەی لای خوارەوەیش چەند ئاوەڵکردارێکی کاتین:
( ئێستا ، ئەمڕۆ ، دوێنێ ، حەفتەیەکی تر ، مانگێکی تر ، بەیانی ، ئێوارە ، نیوەڕۆ ، ئەمساڵ ، لەمەولا ، لەمەوپێش.....هتد ) .

**٢-ئاوەڵکرداری شوێنی :** بەو ئاوەڵکردارانە دەگوترێت کە شوێنی ڕوودانی کرداری ڕستەکە دەستنیشان دەکاتو واتاکەیشی تەواو دەکات .
ئەمانەی لای خوارەوەش چەند ئاوڵکردارێکی شوێنن .
( لەژێر ، لەسەر ، لەخوار ، بەردەم ، لا ، تەنیشت ، چەپ ، ڕاست ، ژێر ، پشت ،.....هتد )

## ڕاهێنانی (١)

لەم ڕستانەی لای خوارەودا ئاوەڵکرداری کاتیو شوێنی دیاری بکە :

١- پارەکەم لەناو ماڵدا لە بیرچوو .

٢- پێرار لە پۆلی سێیەمی ناوەندی بووم .

٣- پشیلەکە لەژێر مێزەکەدا نووستووە .

٤- ئەمساڵ لەپار گەرم ترە .

٥- ئازاد لە تەنیشت جاسمەوە دانیشتووە .

٦- بەیانی زوو لەخەو هەڵدەستم .

٧- چۆلەکەکە لەسەر دارەکەدا هێلانەی کردووە .

٨- لەمەولا کاری خراپ ناکەم .

٩- منداڵەکان لەبان مافورەکەدا یاری ناکەن .

## ڕاهێنانی (٢)

هاودژی ئەم ئاوەڵکردانەی لای خوارەوە بنووسە :

( ژێر ، ناو ، شەو ، چەپ ، بەردەم ، پاش ، ڕۆژهەڵات )

# ڕاهێنانی (٣)

**ئەم بۆشاییانەی لای خوارەوە بە ئاوەڵکردارێك پڕ بکەرەوە :**

کاوە پێنووسەکەی.............جانتاکەی دەرهێنا پاشان پەڕاوەکەی خستە .............مێزەکەی خۆیو دەستی کرد بەنووسینی چیرۆکێکی خۆشو لە هەمانکاتدا هیوای هاوڕێی لە ..............ی دانیشت ، کاوە تەماشای سەعاتەکەی کرد ، کاتژمێر لەو کاتەدا دوازدەی.........بوو، پاشان هەردووکیان بەرەو ............. مامۆستا کەوتنە ڕێ ، مامۆستایش بەم ئیشە زۆر پێخۆشحاڵ بوو .





# واتای وشەکان

| وشە | واتاکەی |
|---|---|
| ئاوەڵکردار | الظرف |
| کات | وقت |
| شوێن | مكان |
| ئێستا | الآن |
| ئەمڕۆ | هذا اليوم |
| دوێنێ | أمس |
| دەگەڕێتەوە | يرجع |
| خەوتووە ، نووستووە | نام |
| بەردەم | امام |
| درۆزن | كذاب |
| گۆم | بركة |
| سەرنج | ملاحظة |
| ڕوودان | حدوث |
| دەستنیشان | تحديد |
| سنوور | حد ، حدود |
| واتا | معنى |
| دانان | وضع |
| تەواوکەر | مكمّل |
| بەکورتی | باختصار |

## گفتوگۆ (( محادثة ))

وانەی یەکەم : کات

وانەی دووەم : یەکترناسین

وانەی سێیەم : لەبازاڕدا

وانەی چوارەم : شۆفێرو مۆڵەتی لێخوڕین

وانەی پێنجەم : چەند ڕستەیەکی جۆراوجۆر

# وانەی یەکەم

## کات

سامان : ڕۆژ باش کاك کاروان .

کاروان : ژیانت باش هاوڕێی خۆشەویستم .

سامان : ئێستا چ کاتێکە ؟

کاروان : ئێستا کاتی بەیانی‌یە (سەر لە بەیانی‌یە) .

سامان : هەرکاتێك بانگی نیوەڕۆ دەستی پێکرد...ئاگادارم بکەرەوە .

کاروان : بۆ؟

سامان : لەبەر ئەوەی دەچم بۆ مزگەوت تا نوێژ بکەم .

کاروان : ئایا دەتوانم چەند پرسیارێکت لێ بکەم ؟

سامان : بەڵێ ، فەرموو .

کاروان : ڕۆژ چەند کاتژمێرە (سەعاتە) ؟

سامان : ڕۆژ بیست‌و چوار کاتژمێرە .

کاروان : ئەی باشە حەفتە چەند ڕۆژە ؟

سامان : حەفتە حەوت ڕۆژە .

کاروان : کامانەن ( چی‌و چین) ؟

سامان : شەممە ، یەکشەممە ، دووشەممە ، سێشەممە ، چوارشەممە ، پێنجشەممە هەینی (جومعە) .

کاروان : مانگێ چەند ڕۆژە ؟

سامان : مانگێ سیَ یان سیَو یەك ڕۆژە .

کاروان : سەدە چەند ساڵە ؟

سامان : سەدە سەد ساڵە .

کاروان : وەرزەکانی ساڵ چین ؟

سامان : بەهار ، هاوین ، پاییز ، زستان .

کاروان : مانگەکانی کوردی چین ؟

سامان : خاکەلێوە (نەورۆز) ، بانەمەڕ (گوڵان) ، جۆزەردان ، پووشپەڕ ، خەرمانان ، گەلاوێژ ، ڕەزبەر ، خەزەلوەر ، سەرماوەز ، بەفرانبار ، ڕێبەندان ، ڕەشەمێ .

کاروان : زۆر سوپاس ، خوا ئاگادارت بێ .

سامان : خواحافیز برای خۆشەویستم .

# واتای وشەکان

| وشە | واتاکەی |
|---|---|
| کات | وقت |
| ئێستا | الان |
| چ ، چی؟ | اي |
| بەیانی | صباح |
| خوا ئاگادارت بێ | يحفظك الله |
| بۆ ، بۆچی ؟ | لماذا؟ |
| تا | حتى |
| نوێژ | صلاة |
| بریتین لە | عبارة عن |
| سەدە | قرن |
| وەرزەکانی ساڵ چین ؟ | ما هي الفصول السنة ؟ |

# وانەی دووەم

## یەکترناسین

– بەیانیت باش (ڕۆژباش) .

– ژیانت باش .

– ناوت چی‌یە ؟

– ناوم دلێرە .

– تەمەنت چەندە ؟

– تەمەنم حەڤدە ساڵە .

– ئیش‌وکارت چییە ؟

– قوتابیم (خوێندکارم)

– لە کام قوتابخانەدا قوتابیت ؟

– لە قوتابخانەی ئامادەیی سیروان قوتابیم ، پۆلی پێنجەمی زانستی .

– ئەی باشە ماڵتان لە کام لایە ؟

– ماڵمان لە پارێزگای بەغدایە ، گەڕەکی کیفاح .

– چەند برات هەیە ؟

– سێ برام هەیە ؟

– ئەی چەند خوشکت هەیە ؟

– تەنها یەك خوشکم هەیە .

– حەزو ئارەزووەکانت چین ؟

– حەزو ئارەزووەکانم بریتین لە خوێندنەوەی کتێبو گۆڤارو ڕۆژنامە هەروەها وەرزش .

– ئەی برای ئازیزم تۆ ناوت چییە ؟

– ناوم نەبەزە ، هاوڕێی دلێرم .

– وا دیارە تۆیش قوتابیت ، وا نییە ؟

– بەڵێ ڕاستت فەرموو ، منیش قوتابیم لە قوتابخانەی ڕەشید ، پۆلی پێنجەمی وێژەیی .

– وانەی زمانی کوردی دەخوێنن ؟

– بەڵێ زمانی کوردی دەخوێنین

– زۆر سوپاس . خواحافیز ، هەرسەرکەوتووبیت .

# واتای وشەکان

| وشە | واتاکەی |
|---|---|
| یەکترناسین | التعارف |
| تەمەن | عمر |
| ئیش‌وکار (پیشە) | عمل (مهنة) |
| ئامادەیی | اعدادية |
| زانستی | علمي |
| وێژەیی (ئەدەبی) | ادبي |
| ماڵتان لە کام لایە ؟ | اين بيتكم ؟ |
| گەڕەك | محله ، حي |
| حەزوئارەزوو | هواية |
| گۆڤار | مجلة |
| ڕۆژنامە | جريدة |
| وا نییە ؟ | اليس كذلك ؟ |
| هیوادارم | اتمنى |
| داهاتوو | مستقبل ، قادم |
| گرنگی | اهتمام |
| دڵسۆز | مخلص |

# وانەی سێیەم

## لە بازاڕدا

– بەیانیت باش ، ئیمڕۆ چیت کڕیوە ؟

– ژیانت باش ، تا ئێستا هیچم نەکڕیوە ، من تازە گەیشتوومەتە ناو بازاڕ .

– ڕاست دەڵێت ، بەڵام من هەندێ میوەو سەوزەم کڕیوە ، وەکو هەرمێو هەنجیرو کاهوو بیبەرو کوولەکەو تەڕەپیاز .

– بۆچی سێوو هەنارو هەڵووژەو زەردەلووت نەکڕیوە ؟

– پێویستم بە میوە نییە چونکە لە ماڵدا هەمانە .

– من دەمەوێ ترێو شووتی بکڕم .

– بێ گومان نرخی هەموو شتێك چووەتە سەرەوە ، بۆ نموونە سێو بە هەزارو حەوت سەدو پەنجا دینارە .

– ئای ئیمڕۆ گران بووە ، ئەی گۆشت یان مریشك یان ماسیت کڕیوە ؟

– بەڵێ گۆشتو مریشكو ماسیم کڕیوە .

زۆر چاکە کیلۆیەك گۆشتت بە چەند کڕیوە ؟

- یەك كیلۆ گۆشتی بێ ئێسكم بە شازدە هەزار دینار كڕیوە .
- شتی دیكەت كڕیوە ؟

- بەڵێ پەنیرو ماستو كەرەو هێلكەشم كڕیوە .
- خواحافیز تا دیدارێكی تر.

# واتای وشەکان

| وشە | واتاکەی |
|---|---|
| چی؟ | ماذا؟ ، ما ؟ |
| کڕین (سەندن) | شراء |
| فرۆشتن | بيع |
| هیچ | لاشيء ، صفر |
| بازار ، بازێڕ | السوق |
| میوە | فاكهة |
| سەوزە | خضرة ، خضروات |
| هەرمێ | كمثري |
| هەنجیر | تين |
| کاهوو | خس |
| کوولەکە | قرع (شجر) |
| بیبەر | فلفل |
| تەڕەپیاز | بصل اخضر |
| سێو | تفاح |
| هەنار | رمان |
| زەردەلوو ، قەیسی | مشمش |
| هەڵووژە | انجاص |
| پێویست | حاجة ، ضرورة |

| | |
|---|---|
| بێ گومان | بدون شك |
| نرخ | سعر |
| گران | باهض ، غالي |
| گۆشت | لحم |
| مريشك ، مامر | دجاج |
| ماسى | سمك |
| چەند ؟ | كم ؟ |
| ئێسك ، ئێسقان | عظم |
| پەنير | جبن |
| كەرە | زبد |
| هێلكە | بيض |

# وانەی چوارەم

## شۆفێرو مۆڵەتی لێخوڕین

**پۆلیس :** تکایە کاکی شۆفێر مۆڵەتی لێخوڕینت پێیە ؟

**شۆفێر :** بەڵێ پۆلیسی بەڕێزم .

**پۆلیس :** دەتوانیت پیشانمی بدەیت ؟ خۆماوەی بەسەردا تێپەڕنەبووە ؟

**شۆفیر :** فەرموو ، ئەوە مۆڵەتەکەمەو ماوەشی بەسەردا تێپەڕنەبووە(نەچووە).

**پۆلیس :** بەڵێ مۆڵەتەکەت یاسایی یە زۆر سوپاس چونکە ئەگەر ماوەی بەسەردا چووبێت .. ئەوا دەتخاتە ژێر باری یاساوە .

**شۆفێر :** نەخێر ،من هەمیشە ڕێزی یاسا دەگرمو هەرگیز سەرپێچی ناکەم.

**پۆلیس :** برای بەڕێزم دلگران مەبە چونکە مۆڵەتی لێخوڕین بۆ سەلامەتیی خۆتو هاولاتیان زۆر گرنگە .

**شۆفێر :** لە کاتی تاقیکردنەوەی لێخوڕین دا شۆفێر شارەزایی ڕێنمایی‌یەکانی هاتووچۆ پەیدادەکات .

**پۆلیس :** دەستخۆش کاکی شۆفێر تۆ شایانی ئۆتۆمبیل لێخوڕینیت .

**شۆفێر :** ڕێزت هەیە گەورەم .

**پۆلیس :** زۆر سوپاس بۆ هاوکاری‌یەکەت .

**شۆفێر :** شایانی نی‌یە .

## واتای وشەکان

| وشه | واتاكەی |
|---|---|
| شۆفێر | سائق السياره |
| مۆڵەت | إجازه |
| مۆڵەتی لێخوڕین | إجازه السوق |
| دڵگران | قلق |
| هاولاتیان | مواكنين |
| گرنگ | مهم |
| تاقی کردنەوە | اختبار ، امتحان |
| هاتووچۆ | مرور |

# وانەی پێنچەم

## چەند ڕستەیەکی جۆراوجۆر

- دوێنێ شەو ساردترین شەوی ساڵ بوو .
- هاوین گەرمترین وەرزی ساڵە .
- شاسوار چاکترین خوێندکاری زانکۆی بەغدایە .
- براکەی تۆ باشترین هاوڕێی کوڕەکەی منە .
- ماسی بەتامترین خۆراکە .
- تۆ پێرێ سێ کیلۆ گۆشتت کڕی .
- ئاسۆ ئەم بەیانییە لە کاتژمێری نۆ لە کوێ بوویت ؟
- ئەوان لە کاتژمێری یازدەو نیو بۆ ماڵی ئێمە هاتن .
- کامەران شەوانە لە کاتژمێری دوازدە کەم چارەك دەنوێت .
- کەی بۆ ئێرە هاتیت ؟
- لە کاتی منداڵییەوە هەردووکمان هاوپۆل بووین .
- مامۆستای زمانی کوردی هەموو ڕۆژ بۆ قوتابخانە دێت .

- ئایا تۆ پەلەتە ؟
- چ پرسیارێکت کرد ؟
- چۆن زانیت ئەو تەمەڵە ؟
- ئەمە هیچ پێویستی‌یەکی بە تۆوە نی‌یە .
- من ڕێگەی ئۆتێلەکەم لێ گوم بووە .
- بە قسەی ناحەزان نەکەیت ، هۆشیار بە ؟
- من لە دەستی ئەو زۆر ڕازیم .
- پیاوێکی زۆر چاکە بەڵام لە ئیش‌کردندا زۆر چالاك نی‌یە .
- ئەو یەك کاتژمێر پێش تۆ ئامادەبوو .
- ببوورە ، ئیش‌وکارم یەکجار زۆرە ، جا لەبەر ئەوە ناتوانم بێم بۆ ماڵتان .
- تا کەی لە شاری خانەقین دەمێنیتەوە ؟
- هەر کاتێك ئەو ببینم هەمیشە هەر خوتوبۆڵە دەکات .
- ماوەیەکی درێژە ئەوم بەرچاو نەکەوتووە (نەدییوە) .

- باشترین کار لای تۆ چی‌یە کە حەزی لێ دەکەیت ؟

- ئەو ئافرەتە جوانانە بەرەو کوێ دەچن ؟

- وڵاتی ئێمە بە نەوت‌و خورماو هەنارو بەڕوو بەناوبانگە .

- من لە ساڵی (١٩٨٠ ز)دا لە شاری ناسرییە لەدایك بووم .

- برا گەورەکەم ئەمە پێنج ساڵە کۆچی دوایی کردووە .

- ئەو خۆی وتی من بەیانی بۆ زانکۆ ناڕۆم .

- تکایە ماڵی ئێوە لە کام لایە ؟

## واتای وشەکان

| وشە | واتاکەی |
| --- | --- |
| جوارو‌جۆر | متنوع |
| ساردترین | ابرد |
| چاکترین ، باشترین | احسن ، افضل |
| تام ، چێژ | طَعمْ ، لذة |
| پێرێ | امس الاول |
| شەوانە | ليلاً، مساءً |
| دەنوێت ، دەخەوێت | ينام |
| ئێرە | هنا |
| پەلە ، خێرا | سرعة |
| تەمەڵ ، تەمبەڵ | كسلان |
| پەیوەستی | رابطة |
| پێویستی | حاجة |
| گوم‌بوون ، ون‌بوون | ضياع |
| هۆشیار | واعي ، مطلع |
| چالاك | نشيط |
| ئامادەبوون | حضور |
| یەکجار | تماماً |
| ماوەیەکی درێژ | مدة طويلة |

# بەشی ویژە

وانەی یەکەم : فایەق بێکەس

وانەی دووەم : قانیع

وانەی سێیەم : پیرەمێرد

# وانەی یەکەم

## فایق بێکەس

ڕۆژو ئەرزو مانگ وا لە گەڕایە
تۆش تێبکۆشە تا هێزت تیایە
ئینسانی ئیشکەر حەبیبی خوایە
بەکەم ڕازی بێت زۆر لە ڕێدایە
سەری بێ ڕۆژی لە ژێر خاکایە

❋ ❋ ❋ ❋ ❋ ❋

مێروولە دەعبای بچووکو وردە
سەیری کە چەند بەدەستو بردە
دایم خەریکە بە کۆشو کردە
پیاوی بێکارە وەك مردوو وایە
سەری بێ ڕۆژی لە ژێر خاکایە

❋ ❋ ❋ ❋ ❋ ❋

به پێی فەرموودەی ئایەتی قورئان

لە سەعی زیاتر نییە بۆ ئینسان

هەوڵو تێکۆشین فەرزە بۆ ژیان

نابێ مەیئوس بی تۆ لەم دنیایە

سەری بێ ڕۆژی لە ژێر خاکایە

✹ ✹ ✹ ✹ ✹ ✹

مەڵێ فەقیرم کوفری نیعمەتە

لەشی ساغ بۆ تۆ موڵکو سەروەتە

پیاوی تەوەزەل لاتو نەگبەتە

قۆڵی لێ هەڵکە بچۆرەکایە

سەری بێ ڕۆژی لە ژێر خاکایە

# کورتە باسێك دەربارەی شاعیری پایەبەرز

## فایق بێکەس

بێ کەس شاعیرێکی پایەبەرزو کوردپەروەر بووەو شیعرەکانی بۆ خـــــزمەتکردنی گـەلو نـیـشـتـمـانـەکـەی تـەرخـان کـردووە ، ناوی فایقەو کوڕی عەبدوللا بەگی کوڕی کاکە حەمەی کوڕی ئەلیاسە قۆجەیە ، بنەماڵەکەیان لە قەڵا چۆلانەو هاتوونەتە سلێمانی ، لە ساڵی (١٩٠٥ز)ی زایینی لە گوندی سیتەك کە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی سلێمانی یەوە لە دایك بووە .

مامۆستا فایق سەرەتا لە قوتابخانەی ئایینی خوێندویەتیو لە پۆلی سێیەمدا وەرئەگیرێو تا ساڵی ١٩٢٣ز بەردەوام ئەبێ لە خوێندن . هەروەها لە ساڵی ١٩٢٤ ــ ١٩٢٥ لە (دار العلوم) لە شاری بەغدا بەسەرئەبا .

لەساڵی ١٩٣٣ ز دا میری بە مامۆستا دایدەمەزرێنێو دەینێرێتە مۆرتەکەی بازیان پاش دەینێرێتە تەوێڵە . لە هاوینی ساڵی (١٩٣٥ ز)یشدا لەگەڵ کۆمەڵە مامۆستایەك کە یەکێکیان مامۆستا گۆرانی شاعیری بەناوبانگ بووە ، بەشداریی لە خولێکدا کردووە کە لە شاری بەغدا بۆ مامۆستایان ئامادەکرابوو . گەلێك شیعری جوانی هەیە ، بە هۆی نیشتمانپەروەرییەوە چەندین جار گیراوە ، دژی ئینگلیزی داگیرکەریش شیعری وتووەو لە ١٩٤٨/١٢/١٨ زایین دا بۆ یەکجاری سەردەنێتەوە .



فایق بێکەس

## واتای وشەکان

| وشە | واتاکەی |
| --- | --- |
| گەڕان | دوران ، حركة |
| تێکۆشان | سعي |
| هێز | قوة |
| ئیشکەر | صاحب عمل ، ذو عمل |
| ڕێ | طريق |
| ڕۆزی | رزق |
| خاك | تراب |
| مێروولە | نملة |
| دەعبا | دابة |
| ورد | ناعم |
| بێکار | بدون عمل ، عاطل عن العمل |
| بەپێی | حسب |
| هەوڵدان | محاولة |
| لەش ساغ | سليم ، سليم الصحة |
| تەوەزەل ، بێخیرەت | خامل ، كسلان |
| نەگبەت | يائس ، سيء الحظ ، تعس |
| قۆڵ ، باڵ | ذراع |
| کایە | وجود |

# وانەی دووەم
## قانیع
## ١٩٠٠ز- ١٩٦٥ز

ئەمانەی لای خوارەوە چەند هۆنراوەیەکی هۆزانڤان مامۆستا (قانیع)ن کە دەربارەی کارکردن و پیشەکەنی تەمبەڵی و پیاوەتی کردن و خەریك بوونی فێربوون و زانست دەڵێ :

چەند خۆشە کورم ئارەق برێژین
لە دەشت و دەرا غیرەت بنوێنین

چاکی و پیاوەتی بەرمەدە لە دەس
بۆ هاشەو هوشە گوێ مەدە بەکەس

وەنیە تۆ کەو بی و ئەم دنیا قەفەس
برۆ هەر لایە کە ئارەزووت هەس

نیوەی بەرهەمت هەر بۆ بێ نەوا
خۆت رسوا مەکە بۆ کراس و کەوا

هێندە بخوێنە کە خوێندەوار بی
لە ناو کۆمەڵدا زرنگ و وشیار بی

# گۆشەیەك لە ژیانی مامۆستا قانیع

١٩٠٠ز – ١٩٦٥ز

ئەم شاعیرە گەورەیە ، ناوی (محمد شێخ عبد القادر)ە ، لە ساڵی ١٩٠٠ز دا لە دێی (ریشێن)ی شارەزوور لە دایکبووە ، لە تەمەنی منداڵیدا باوكو دایكی مردوون ، بە هەتیوی لای (سەید حسینی چۆڕی) گەورە بووە ، هەر ئەویش ناوێتیە بەر خوێندن ، پاشان بە فەقێیەتی چووە بۆ سلێمانیو چەند ساڵێك لەوێ ماوەتەوە ، هەر لەوێ خوێندنی مەلایەتی لە لای مامۆستا شێخ عومەری قەرەداغی تەواوكردووە ، ماوەیەك ئاشەوانیو مەلایەتیو مامۆستایی كردووە ، زۆر بە هەژاریی ژیاوە ، لە ساڵی (١٩٦٥)ز دا لە گوندی (لەنگەدێ)ی شلێری ناوچەی پێنجوێن كۆچی دوایی دەكات .

قانیع لە ئەدەبو زمانی كوردیو فارسیو عەرەبیدا دەستێكی باڵای هەبووە، بەهەر سێ زمانەكە شیعری گوتووە ، زۆر حەزی لە مێژووی گەلو نیشتمانەكەی خۆی بووە ،قانیع عاشقی دیمەنو سروشتی جوانی كوردستان بوو، بۆیە زۆرینەی شیعرەكانی لە باسی جوانی كوردستانو خۆشەویستی نیشتمانو ئامۆژگاری خەڵك بۆ تێكۆشانو خەبات لە پێناوی رزگاری كوردو كوردستاندا بووە .

شیعرەكانی قانیع زۆرینەیان نیشتمانیو نەتەوایەتینو شیعری دڵداریيو كۆمەڵایەتیشی زۆرن .



وێنەیەکی شاعیری مەزن مامۆستا قانیع

# واتای وشەکان

| وشه | واتاکەی |
| --- | --- |
| پارچه | قطعة |
| هەڵبەست | بيت شعر |
| ڕیشەکەن | اجتثاث |
| تەمەڵی | كسل |
| پیاوەتی | مروءة |
| فێربوون | تعلّم |
| زانست | علم |
| بڕێژین | نسكب |
| نواندن | اظهار |
| بەردان | افلات |
| بەرمەدە | لاتفلت |
| گوێ مەدە | لاتهتم |
| کەس | شخص |
| کەو | قبج |
| هەس ، هەیە | يوجد |
| بەرهەم | إنتاج |
| بێ نەوا | محتاج ، مشرد |
| کراس (جلوبەرگ) | ملابس ، قميص |
| کەوا | قباء |
| خوێندەوار | متعلم |
| کۆمەڵ | مجتمع |
| زرنگ | ذكي |
| وشیار | واعي |

# وانەی سێیەم

## پیرەمێرد

### نەورۆز

ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە
جەژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشیو بەهاتەوە

چەند ساڵ گوڵی هیوای ئێمە پێ پەست بوو تاکو پار
هەر خوێنی لاوەکان بوو گوڵی ئاڵی نێو بەهار

نەورۆز بوو ئاگرێکی وەهای خستە جەرگەوە
لاوان بە عشق ئەچوون بەرەوپیری مەرگەوە

تا ئێستا ڕووی نەداوە لە تاریخی میللەتا
قەڵغانی گوللە سینگی کچان بێ لە هەڵمەتا

پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەنو گرین
نامرن ئەوان وا لە دڵی میللەتا ئەژین

گۆشەیەك لە ژیانی مامۆستا پیرەمێرد :

پیرەمێردی شاعیر ، خاوەنی بیروباوەڕێکی پێشکەوتووی ڕووناکبیر بووە ، باوەڕی تەواویشی بە زانست خوێندەواری هەبووە ، ناوی حاجی تۆفیقی کوڕی مەحموود ئاغای مەسرەفە ، لە ساڵی ١٨٦٧ ز لە شاری سلێمانی لەدایك بووە .

پیرەمێردی هۆزانڤان ، لە ساڵی ١٨٩٩ ز دەکرێتە ئەندامی ئەنجوومەنی باڵا لە ئەستەنبووڵ هەر لەوکاتەدا دەچێتە (مەکتەبی حقوق)و بڕوانامەی (حقوق) وەردەگرێت . بووە بە قایمقامی (جۆلە مێرگ)و لە ساڵی ١٩١٨ز بوو بە پارێزگاری (ئەمسایە) لە تورکیا .

لە ساڵی (١٩٣٧ز)یش چاپخانەیەكو ڕۆژنامەیەکی دامەزراند بەناوی (ژین)ەوە ، لە نۆزدەی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٠ز کۆچی دوایی کردووە .

بە بۆنەی ساڵیادی کۆچکردنیو تێپەڕبوونی (٢٠) ساڵ بەسەر مردنی دا شاعیری گەورەی عیراقو عەرەب (محمد مهدی الجواهری) لەگەڵ دەیەها نووسەری بەناوبانگی عیراق لە کوردو عەرەبو برانتەوەکانی تر لە شاری سلێمانی بە وتار خوێندنەوەو هۆنراوە یادی ئەو بۆنە پیرۆزەیان کردۆتەوە .

## واتای وشەکان

| وشه | واتاکەی |
| --- | --- |
| کۆن | قديم |
| هیوا | أمل |
| پەست | حزين ، منخفض |
| ئاڵ | احمر فاتح |
| جەرگ | كبد |
| بەرەوپیری | استقبال |
| مەرگ | الموت |
| قەڵغان | درع |
| گولله | طلقة |
| سینگ | صدر |
| هەڵمەت | هجوم ، حملة |
| پەستبوون | تألم ، تأثر |
| پەستکردن | ازعاج |

# بەشی خوێندنەوە

وانەی یەکەم : ئەرکی سەرشانی ئێوە بەرامبەر باوك و دایکتان چی یە ؟

وانەی دووەم : شاری سلێمانی (شاری هەڵمەتو قوربانی)

وانەی سێیەم : زانای گەورەی کورد توفیق وەهبی

وانەی چوارەم : مەلاعەبدولکەریمی مودەریس

## وانەی یەکەم

### ئەرکی سەرشانی ئێوە بەرامبەر باوك و دایکتان چی یە ؟

ئەی ڕۆڵە ئازیزەکان ئەوە بزانن کە باوك و دایکتان هۆی هەبوونی ئێوەیە لە ژیاندا ، جا لەبەر ئەوە دەبێت لە گەڵیاندا خۆش ڕەفتارو بەئەمەك بن و مەرجو ئەرکەکانی فەرزەندایەتی جێبەجێ بکەنو چاوتان لێیان بێت ، چونکە مافێکی زۆریان بەسەرتانەوە هەیە ، بەلاّم ئەگەر لەگەڵیاندا ڕەفتارو کردەوەتان باش نەبێت شایانی ئەوە نابن بە ئادەمیزاد ناوتان بنێنو لە دەستەی لاوچاکانو بەخشندەکان دەردەچنو نائومێد دەبن .

*****

ئازیزەکان لەگەڵ دایكو باوکتاندا قسەتان خۆش بێت ، لێیان تووڕە مەبنو گوێڕایەڵی ئامۆژگارییەکانیان بن تاوەکو کاتێك ببن بە خاوەن خێزان ڕۆڵەکانتان لەگەڵتان باش بن . ئەو کەسانەی کە ڕێز لە باوكو دایکیان دەگرن خوای مەزن ڕحمیان لێ دەکاتو ئاگاداریان دەبێتو ژیانیان ئاسوودە دەبێت . ئەوەش لە یاد نەکەن کە بەختیاریو خۆشی ژیانی ئێوە لەم دونیایەدا ئەوەیە کە باوكو دایکتان لێتان رازی بێت .

دایکی دڵسۆزو ئازیزمان لە کاتی منداڵی دا هەموو شەوێك بێ وچان لە پێناوی پەروەردەکردنی ئێمەدا لە خەوی خۆشی خۆیاندا بێ بەش بوونەو چاویان لە ئێمە بووە تاوەکو گەورەمان بکەن و تەندروستیمان چاك بێت . سۆزو میهرەبانی ئەوان بووەتە هۆی ئەوەی کە ئێمە بتوانین بخوێنین و زانست و ئەدەبمان دەستگیرببێت و ببین بە خاوەن پلەوپایە . سوپاسێکی بێ پایان . ئاراستەی ئەوان دەکەین بۆ گشت هەوڵەکانیان کە لە پێناوی ئێمەدا تەرخانیان کردووە .



## ڕاهێنانی (١)

بەوردی بابەتەکە بخوێنە ، پاشان وەڵامی ئەم پرسیارانەی لای خوارەوە بدەرەوە :

١ – کێ هۆی هەبوونی ئێوەیە لە ژیاندا ؟

٢ – ئەگەر ڕەفتارتان لەگەڵ باوك و دایکتاندا باش نەبێت لە دەستەی چی دەردەچن ؟

٣ – ئەگەر ڕەفتارتان لەگەڵ باوك و دایکتاندا باش بێت ڕوڵەکانتان لەگەڵتاندا چۆن دەبن ؟

٤ – بەختیاریی و خۆشی ژیانی ئێوە لەم دونیایەدا چی یە ؟

## ڕاهێنانی (٢)

ئەم بۆشاییانەی لای خوارەوە بەم وشانە پڕبکەرەوە :

( تەرخانکردووە ، ماف ، هۆ ، سوپاست ، ئەوان )

١– باوك و دایکتان ------ ێکی زۆریان بە سەرتانەوە هەیە .

٢– سۆزو میهرەبانی ------ بووەتە ------ ی ئەوەی کە ئێمە دەتوانین بخوێنین و زانست و ئەدبمان دەستگیرببێت .

٣– سوپاسێکی بێ پایان ئاڕاستەی ------- دەکەین بۆ گشت. هەوڵەکانیان کە لە پێناوی ئێمەدا ------- .

## ڕاهێنانی (٣)

هاوواتای ئەم وشانەی لای خوارەوە بنووسە :

١ – ڕەفتار

٢ – دایك

٣ – بێ گومان

٤ – ئاڕاستە

٥ – ڕۆڵەکانتان

٦ – بێ وچان

٧ – چنگ دەکەوێت

٨ – ئەدەب

٩ – لەپێناو

١٠ – کۆشش



## ڕاهێنانی (٤)

مروڤ دەبێت لەگەڵ باوك و دایکیاندا چۆن رەفتار بکەن ، بۆ ئەم مەبەستە سێ دێڕ بنووسە :

١ـ ----------------------------------------

٢ـ ----------------------------------------

٣ـ ----------------------------------------

# واتای وشەکان

| واتاکەی | وشە |
|---|---|
| واجب | ئەرك |
| امام ، ازاء | بەرامبەر |
| اولاد | ڕۆڵەکان |
| وجود | هەبوون |
| شرط | مەرج |
| انسان | ئادەمیزاد |
| جماعة ، زمرة / باقة | دەستە |
| سعادة | بەختیاری |
| یرضی | رازی دەبێت |
| بدون شك ، بلا ریب | بێ گومان |
| کلما | هەرچەند |
| تخرجون | دەردەچن |
| من أجل | لەپێناو |
| کبیر ، عظیم | مەزن |
| نقدر ، نستطیع | دەتوانین |
| حصول ، نیل | دەستگیربوون |
| اتجاه | ئاڕاستە |
| بلا نهایة | بێ پایان |

## وانەی دووەم

### شاری سلێمانی ((شاری هەڵمەت و قوربانی))





شاری سلێمانی

سلێمانی شارێکی کوردستانی عێراقی فیدراڵی خۆشەویستمانە، کەوتۆتە ناوچەی شارەزوورەوە کە دەکەوێتە بەشی سەرووی ڕۆژهەڵاتی وڵاتەکەمانەوە. ئەم شارە خنجیلانە پاشای بابان.. لەساڵی (١٧٨٤ ) ی زایینی دا بەردی بناغەی داناوەو لە مێژەوە مەڵبەندی فەرمان ڕەوایی نەتەوەی کورد بووە .

هەروەها شاری سلێمانی بە شاری ڕۆشنبیریش ناسراوە چونکە چەند لایەنێك هەیە کە لە ژیانی سلێمانی دا ناتوانرێت هەرگیز فەرامۆشی بکرێت ئەویش ژیانی ئەدەبیو ڕۆشنبیری‌یە کە باخچەیەکی گەورەی لەو بوارەدا پێشکەش بە

مێژووی ڕۆشنبیری کوردستان کردووە ،هەموو ئەو بەرفراوانییەش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بابانی یەکان سلێمانی سەرچاوەی وێژەو هونەرو مێژووش بووە ، سەرەڕای ئەوەش زنجیرەیێکی نەپچڕاوی لە پیاوچاکانو کەسایەتی یە لاو چاکە بەناویانگەکانو تێکۆشەر لەم شارە دێرینەدا چاویان بە ژیان هەڵهێناوە وەك شێخ مارف نۆدێیو کاك ئەحمەدی شێخو شێخ مەحموودی مەلیكو کۆمەڵێك لە شاعیرانی بەتواناو بلیمەت ، لەوانە : نالیو کوردیو سالمو بێخودو بێکەسو پیرەمێردو گۆرانو زێوەرو تۆفیق وەهبیو وەلی دیوانە دەیەها بەڵکو سەدەها کەسانی ناودارو پلەداری دیکە .

کۆمەڵێ کەژی گەردن کەش ئەم شارەی لە باوش گرتووە وەك: گۆیژەو ئەزمڕو پیرەمەگروون بەشێوەیەکی وا بووەتە جێی سەرەنج ڕاکێشانی گەشتیارانو شارەکەیان رازاندووەتەوەو دڵگیریان کردووەو هەروەها لەم شارەدا گەلێك گەڕەکی جوانو دڵگیری لێیە وەکو گەڕەکی هەوارەبەرزەو ئەزمڕو گوێژەی نوێو ئازادیو بەختیاریو کارێزە وشكو هەواری تازەو داوەفاو کانی ئاسکانو شۆڕشو سەرچنارو چوارچراو...هتد.

## ڕاهێنانی (١)

وانەکە بەوردی بخوێنەرەوە پاشان وەڵامی ئەم پرسیارانەی لای خوارەوە بدەرەوە؟

١- شاری سلێمانی بە چی ناسراوە ؟

٢- کەی شاری سلێمانی بەردی بناغەی دانرا ؟

٣- سلێمانی کەوتۆتە کام لای وڵاتەکەمانەوە ؟

٤- ناوی چەند شاعیرێکی شاری سلێمانی بڵێ ؟

٥- چی شاری سلێمانی لە باوەش گرتووە ؟



## ڕاهێنانی (٢)

ئەم ڕستانەی خوارەوە لە ڕووی ڕێکخستنی وشەوە هەڵەن ، لە وانەکەدا بیاندۆزەرەوەو هەڵەکانیان ڕاست بکەرەوە ، پاشان بەشێوەیەکی ڕاست دایان ڕێژە:

١- سلێمانی ناسراوە شاری هەڵمەت و بە قوربانی .

٢- سلێمانی بەردی بناغەی داناوە سلێمان پاشای بابان .

٣- بووە ئەم شارە مێژەوە لە مەڵبەندی فەرمان ڕەوایی نەتەوەی کورد .

٤- ئەم شارەی گرتووە لە باوەش کۆمەڵی کەژی گەردن کەش .

## ڕاهێنانی (٣)

هاودژی ئەم وشانەی خوارەوە بنووسە :

١- شار
٢- ڕۆژهەڵات
٣- نەپچڕاو
٤- کۆمەڵ
٥- دێرین
٦- دلێر
٧- هۆشدار
٨- چالاك
٩- ژیان
١٠- بەتام

# واتای وشەکان

| وشە | واتاکەی |
| --- | --- |
| هەڵمەت | حملة |
| کەوتۆتە | تقع |
| ڕۆژهەڵات | شرق |
| زایینی | ميلادي |
| بەردی بناغە | حجر اساس |
| مەڵبەند | مركز |
| فەرمان ڕەوایی | حكم |
| زنجیرە | سلسلة |
| نەپچڕاو | متواصل ، بدون انقطاع |
| کەسایەتی | شخصية |
| لاوچاکان | فرسان |
| دێرین | عريق ، قديم |
| دەیەها | عشرات |
| بلیمەت | عبقري |
| گەڕەك | محلة |

## وانەی سێیەم

# زانای گەورەی کورد
## تۆفیق وەهبی
### ١٨٩١- ١٩٨٤ز

زانای گەورەی کورد (تۆفیق وەهبی) کوڕی مەحەمەدە ، لە سلێمانی لە دایکبووە ، لە ساڵی١٩٠٨ز دا ئامادەیی سەربازیی لە بەغدا تەواوکردووە، پاشان چۆتە ئەستەمبوڵ خوێندنی باڵاو ئەرکانی تەواوکردووە ، بەشداری جەنگی یەکەمی جیهانی کردووە .لە مانگی ئابی ١٩١٩ ز دا تۆفیق وەهبی گەڕایەوە بۆ عێراقو کرا بە قایمقامی ڕانیە .لە کۆتایی سییەکانی سەدەی بیستەمەوە لە کاری سیاسیو دەوڵەتی دوورکەوتەوەو ، بۆ خزمەتی وشەی کوردی ، خۆی تەرخان کردووە ، شارەزاییو دڵسۆزی تۆفیق وەهبی هێندە زۆر بوو کردیان بە ئەندامی کاراو جێگری یەکەمی سەرۆکی (کۆڕی زانیاری عیراق) ، چەند جارێك بەناوی عێراقەوە لە کۆنگرە زانستییە جیهانییەکاندا بەشداری کردووە ، کەساڵی ١٩٧٠ (کۆری زانیاری کورد) دامەزرا ، تۆفیق وەهبی یەکەم کەس بووکە بە ئەندامی شەرەف ئەو کۆڕە هەڵبژێردرا . تۆفیق وەهبی زۆر بایەخی دەدا بە زمانی کوردی ، چونکە باوەڕی وا بوو کە لە بارودۆخی ناسکی کوردستاندا زمان قەڵغانی یەکەمی پاراستنی نەتەوەیە .

له سالّی ( ١٩٢٩ـ ١٩٣٠ز)دا کتێبی (دەستووری زمانی کوردی) دانا ، کە بە یەکەم کتێبی زمانەوانی کوردی دەژمێردرێت .

ئەم زانا گەورەیی کوردە ، لە بواری چیرۆکنوسیشدا بۆ ڕۆژگاری خۆی سوارچاکێکی بێ وێنە بووە، چیرۆکەکانی (بەختیارو بەدبەخت) و (قەزای گۆزە کەوت لە دیزە) ، یان ئەو چیرۆکانەی کە لە ڕۆژنامەی (دەنگی گێتی تازە)دا بڵاوی کردونەتەوە،سەرجەمیان لەڕووی زمانەوە شیرینو ڕەوانن ، لەڕووی هوونەرەوە بێ گرێو تۆکمەن .سەرقالّی(دەستووری زمانی کوردی)و(ڕێنووسی کوردی بە عەرەبیو بە لاتینی) و (بارامی گۆڕ) و (مێژووی ناوی کەرکووكو شارەزور) و دەیان باسی تر بوو ، لە ڕۆژنامەی (دەنگی گێتی تازە)دا چوار بەرهەمی بەپێزی تری لە بارەی : مەمو زینی ئەحمەدی خانی و پیرەمێردو دەستووری زمانی کوردیو (ئەحەی کورنوو)ی بڵاوکردەوە . ئەمانەو دەیان نووسینی بەپێز قەرزی تۆفیق وەهبین بەسەر کوردەوە ، لەبەرئەوە لە مانگی کانوونی١٩٨٤ز دا بە هەزاران کورد بوون بە وەجاخو ئەوەی ئەو ، لەسەر داوای خۆی تەرمەکەیان بە چیای پیرەمەگروونی سەرکەش سپارد .



توفیق وەهبی







## ڕاهێنانی (١)

**وەڵامی ئەم پرسیارانەی لای خوارەوە بدەرەوە :**

١- تۆفیق وەهبی لە چ ساڵێك لە دایك بووە ؟

٢- كۆڕی زانیاری كوردی لە كام ساڵەدا دامەزراوە ؟

٣- ئەو كتێبانە كامانەن كە لە ساڵی (١٩٢٩-١٩٣٠ز)دا دایان‌ناون ؟

٤- كەی تۆفیق وەهبی چووەتە ئەستەمبوڵ بۆ تەواوكردنی خوێندنی بالآو ئەركان؟

## ڕاهێنانی (٢)

**نیشانەی (✓) بەرامبەر وەڵامی ڕاست دابنێ‌و نیشانەی (✗)یش بەرامبەر وەڵامی هەڵە دابنێ‌و پاشان هەڵەكان ڕاست بكەرەوە ئەگەر هەبوو :**

١- لە ساڵی (١٩٢٩)ی زایینی تۆفیق وەهبی گەڕایەوە بۆ عیراق .

٢- زانای گەورەی كورد مامۆستا تۆفیق وەهبی تەنها جارێك بەناوی عیراقەوە لە كۆنگرە زانستی یە جیهانی یەكاندا بەشداریی كردووە ؟

٣- مامۆستا تۆفیق وەهبی كەم سەری لە بواری چیرۆك نووسیندا بۆتەوە .

٤- زانای گەورەی كورد مامۆستا تۆفیق وەهبی لە شاری سەرسەنگ لە دایك بووە .

## ڕاهێنانی (٣)

**هاوواتای ئەم وشانەی لای خوارەوە بدەرەوە :**

گەلێك ، شارەزا ، وشە ، بایەخ ، ناسك ، گێتی ، سەرجەم ، تەرەم ، داوا.



## واتای وشەکان

| وشە | واتاکەی |
|---|---|
| خوێندنی باڵا | التعليم العالي |
| وتار | مقاله |
| گۆڤار | مجله |
| داڕشتن | صياغه ، انشاو |
| زنجیره | سلسله |
| سەرقاڵی | انشغال |
| ڕێنووس | املاو |
| تازه ، نوێ | جديد |
| زمانەوان | لغوى |
| وەجاخ | ژريه ، اصل |

وانەی چوارەم

# مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس

## ١٩٠٦- ٢٠٠٥ز

ئەم زانا هەڵکەوتووە بەناوبانگە لە گوندی (تکیە)ی نزیک خورماڵ لە پارێزگای سلێمانی لەدایکبووە، لە تەمەنی منداڵیدا باوکی کۆچی دوایی کردووە ، دایکیو مامەکانی سەرپەرشتیان کردووە .

لە پاش چەند ساڵێك لەسەر داوای (شێخ عەلائەددین) دەبێتە مەلاو مودەڕیسی بیارە . لە ساڵی١٩٥١دا لە بیارەوە دەچێتە سلێمانی و دەبێتە مەلایەکی بەناوبانگو خۆشەویست ، لە ساڵی ١٩٥٤دا دەچێتە کەرکووكو دەبێتە مودەڕیسو مەلای تەکیەی تاڵەبانی . لە پاش ماوەیەك دەگوازرێتەوە بۆ بەغدا لە مزگەوتی (ئەحمەدی) نزیك وەزارەتی بەرگری ، لە پاش تاقیکردنەوە دەبێتە مودەریس لە مزگەوتی غەوس ، لە ساڵی١٩٧٣دا خانەنشین دەکرێت بەڵام لە هەموو وڵاتانی عەرەبیو ئیسلامەوە زانستخوازانی ئاینی دێنە لایو دەخوێنن . ئەم کەڵە زانایە لە بەغدا دەبێتە مەشخەڵانێك بۆ کوردو بۆ ئەدەبو مێژووی کورد...بۆ زانستە ئیسلامییەکان . مەلاعبدولکەریم هەتا ساڵی ( **١٩٨٣** )زیاتر لە (٤٧) کتێب بە عەرەبیو کوردیو فارسی داناوە ، هەندێ لەو کتێبانە وەك (تەفسیری نامی)(٧_٨) بەرگنو زۆربەیان چاپکراون . مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە مزگەوتی گەیلانی لە بەغدا شەرەفی ئەوەی پێدراوە کە لە

غەوسـدا پێشـنوێژی عەسـرو نیوەڕۆ بـکاتو وانە بـە زانستخوازان بڵێت ، پاشان بووە بە (موفتی هەموو عیراق) ، لە ساڵانی ١٩٧٤ ـ ٢٠٠٣ دا سەرۆکی (رابیتەی زانایانی ئیسلام) بووە لە عیراق ، لە ساڵی ١٩٧٤ز هەتا کۆچی دوایی ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری عیراق بووە، بەڵام ئەندامێتی مامۆستاو کارای لە کۆڕدا لە(١٥) ساڵ زیاتر نییەو دواتر (ئەندامی شەرەف)ی کۆڕ بووە ، لە شەوی٢٩/٣٠ـ ٨ـ ٢٠٠٥ دڵە پڕ لە زانستو نوورەکەی وەستاو ماڵئاوایی کرد لە گەلەکەیو ناوی شکۆداری هەمیشە زیندووە لە کوردستانو لە عیراقو جیهانی ئیسلامدا .



وێنەی مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس

## ڕاهێنانی (١)

وەڵامی ئەم پرسیارانەی لای خوارەوە بدەوە :

١- مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە ساڵی چەند لە دایک بووە ؟

٢- مەلا عەبدولکەریم کەی باوکی کۆچی دوایی کردووە ؟

٣- مەلا عەبدولکەریم لە سەر داوای کێ دەبێتە مەلاو مودەڕیسی بیارە ؟

٤- مەلا عەبدولکەریم لە چ ساڵێک خانەنشینی دەکرێت ؟

## ڕاهێنانی (٢)

هاوواتای ئەم وشانەی لای خوارەوە بنووسە :

تاقیکردنەوە – کۆچیدوایی – پاش – مۆڵەت – کۆدەبنەوە

بەناوبانگ – ئەدەب – ئەمڕۆ – ئاسوودە – هەمیشە .

## ڕاهێنانی (٣)

هاودژی ئەم وشانەی لای خوارەوە بنووسە :

نزیک – زۆر – باش – دەچێت – ژیان – گوند

# واتای وشەکان

| واتاکەی | وشە |
|---|---|
| عالم | زانا |
| عبقري | هەڵکەوتوو |
| اسم مدينة في محافظة السليمانية | خۆرماڵ |
| عم | مامە |
| اشراف | سەرپەرشتیکردن |
| زمن | ڕۆژگار |
| جامع | مزگەوت |
| العلوم | زانستەکان |
| دين | ئایین |
| قبول | وەرگرتن |
| طلاب العلم | زانستخوازان |
| تجمع، اجتماع | کۆبوونەوە |
| نقل | گواستنەوە |
| دفاع | بەرگری |
| تقاعد | خانەنشین |
| شعلة | مەشخەڵان |
| مجال | بوار |
| محاضرة | وانەوتنەوە |

| | |
|---|---|
| مۆڵەت | اجازة ، رخصة |
| دانان ، ئامادەکردن | اعداد ، وضع |
| کۆڕی زانیاری | المجمع علمي |
| ئەندامێتی | عضوية |
| کارایی | مهارة |
| هەمیشە زیندووە | خالد |

# خۆڕاهاتن لەسەر وەرگێڕان و چۆنیتی داڕشتنی

| | |
|---|---|
| ڕۆژ باش . | نهارك سعيد . |
| تكایە ، كام ڕێگای بەرەو قوتابخانەی ئازادی دەڕوات . | من فضلك ، اي الطريق المؤدي الى مدرسة آزادي . |
| لێرەوە . | من هنا . |
| چۆن دەتوانم بگەمە قوتابخانەناو براوەكە ؟ | كيف استطيع أن اصل الى المدرسة المذكورة ؟ |
| ناوی ئەم شەقامە چی‌یە ؟ | ما اسم هذا الشارع ؟ |
| ئێمە بەدوای ئەم ناونیشانە دەگەڕێین . | اننا نبحثُ عن هذا العنوان . |
| ئایا دەتوانیت بەهۆی ئەم نەخشەوە ڕێنماییم بكەیت ؟ | هل تستطيع ان ترشدني بواسطة هذه الخريطة ؟ |
| بێ گومان ڕێگاكەمان لێ ون بوو . | لقد ضَلَلْنا الطريق . |
| ئایا دەتوانین بەپێ بڕۆین ؟ | هل نستطيع ان نذهب الى هناك مشياً ؟ |
| بەڵێ ، بە خۆشی یەوە . | نعم ، بكل سرور . |
| تكایە كاتژمێر چەندە ؟ | كم الساعة من فضلك ؟ |
| كاتژمێر دوانزەی نیوەڕۆیە . | الساعة الثانية عشر ظهراً . |
| نەختێك چاوەڕوانم بە . | انتظرني قليلاً . |

| | |
|---|---|
| دەمەوێت لەگەڵ کاک...بدوێم(قسەبکەم) | اريد ان اتكلم مع السيد ... |
| ببوورە دەتوانم چراکە بکوژێنمەوە ؟ | عفواً اقدر ان اطفئ المصباح ؟ |
| ئایا دەتوانیت بۆ گەراجی ئۆتۆمبیلەکان ڕێنماییم بکەیت ؟ | هل تستطيع ان تدلني الى كراج السيارات ؟ |
| ئایا ئەم پاسە بۆ بەڕێوەبەرایەتی گشتی خوێندنی کوردی دەڕوات ؟ | هل سيذهب هذا الباص الى المديرية العامة للدراسة الكردية ؟ |
| تکایە پێم بڵێ ڕێگای وەزارەتی پەروەردە لە کوێیە ؟ | قل لي من فضلك اين الطريق الى وزاره التربيه . |
| لە کاتژمێری چەند فڕۆکەکە دەکەوێتە ڕێ ؟ | في اي ساعة تقلع الطائرة ؟ |
| دەمەوێت بە زووترین کات بگەمە فەرمانگەکەمان . | اريد ان اصل الى دائرتنا بأسرع وقت . |
| ئەم شەو دەمەوێت زوو بنووم(بخەوم) . | اريد ان انام هذه الليلة مبكراً . |
| بۆ بەشی زمانی کوردی ڕۆیشتم. | ذهبت الى قسم اللغة الكردية . |
| نووسینگەی بەڕێز بەڕێوەبەری گشتی لەکام لایە ؟ | اين مكتب السيد المدير العام ؟ |
| کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەینێ . | لاتؤجل عمل اليوم الى الغد . |

| | |
|---|---|
| پیاوەتی بکە تکایە لێرە دابنیشم؟ | اجلس هنا من فضلك ؟ |
| ببوورە ، کتێبەکان لە ڕێو شوێنی خۆیاندا دابنێ . | عفواً ، ضع الكتب في اماكنها . |
| کتێبەکەم خوێند بۆ ئەوەی سوودی لێ وەربگرم | قرأتُ الكتابَ كي أستفيد منهُ |
| ئەم کێشەیە زۆر ئالۆزە . | هذهِ المسألة معقدة جداً . |
| سەری بۆ پێشەوە بەرەو سینگ شۆڕدەکاتەوە (نیشانەی شەرم گرتنە). | يدلي رأسهُ الى الامام نحو الصدر (علامة على الخجل) . |
| سەرت لە پەنجەرەکەوە مەهێنە دەرەوە . | لا تخرج رأسك من النافذة . |
| لێرەدا بۆ ماوەی دوو حەفتە دەمێنینەوە . | نبقى هنا لمدة اسبوعين . |
| کەی بۆ نیشتمان دەگەڕێتەوە ؟ | متى ستعود الى الوطن ؟ |
| تۆ بۆ کام لا دەچێت ؟ | الى اين انت ذاهب ؟ |
| کام کتێبە دەخوێنیت ؟ | اي كتاب تقرأ ؟ |
| لەناو کتێبخانەکەدا فەرهەنگی زۆر هەیە . | يوجد في المكتبة كثير من القواميس . |
| مامۆستاکە لە کۆنگرەکەدا گەڕایەوە . | عاد الاستاذ من المؤتمر . |

باخەوانەکە لە ژێر درەختەکەدا دانیشت .

جلس البستاني تحت الشجرة .

ماڵمان دەکەوێتە ناوچەی شوعلە لە بەغدا .

يقع منزلنا في منطقة الشعلة في بغداد .

کارەکە سێ کاتژمێر دەخایەنێت.

يستغرق العمل ثلاث ساعات .

ناتوانم لەو دەستەواژە تێبگەم .

لا استطيع ان افهم تلك العبارة .

کامەران قوتابییەکی ڕووخۆشە .

كامران طالب مريح .

تابلۆی کلیلەکانی فەرمانگەکە .

لوحة مفاتيح الدائرة .

ئایا تۆ خوێنەرێکی خێرایت ؟

هل انت قارئٌ سريع ؟

چاوم کەوتە سەحەری ئامۆزام .

التقيت ابنة عمي سحر .

ئەو پیاوەی کە بینیم ، هۆزانڤانێکی کوردی بوو .

الرجل الذي رأيته ، كان شاعراً كوردي .

ئەم سەعاتە زێڕە .

هذه الساعةُ من ذهب .

دایکی خۆشەویستو باوکی بەڕێزت لە کوێن ؟

اين والدتك العزيزة و والدك المحترم؟

| | |
|---|---|
| چیت دەویٚ ؟ | ماذا تريد ؟ |
| چی ڕووی داوە ؟ | ماذا حدث ؟ |
| کیٚ لیٚرەیە ؟ | من هنا ؟ |
| ناونیشانم ئەمەیە ؟ | هذا عنواني . |
| ئەو بیٚ کارە . | انها عاطلة عن العمل . |
| وا ئەمە دەبەم . | سأأخذ هذا . |
| ئەمە هەرزانە . | هذا رخيص . |
| ئەمە زۆرگرانە . | هذا غال جداً |
| لە یەك کاتدا . | في آن واحد . |
| لە هەمان کاتدا . | في نفس الوقت . |
| تکایە لیٚرەوە . | ارجوك من هنا . |
| تکایە گویٚم لیٚ بگرە . | اسمعني رجاءً . |
| ڕیٚگاکە داخراوە . | الطريق مغلق . |

| | |
|---|---|
| سەرم ژان دەکات . | رأسي يؤلمني . |
| بۆ کام لا دەچیت . | الى اين تذهب ؟ |
| چوونە ژوورەوە قەدەغەیە . | الدخول ممنوع . |
| ناونیشانەکەی ئەمەیە . | هذا عنوانه . |
| ئەمە لەوێدا دابنێ . | ضع هذا هناك . |
| کێ ئەمەی بە تۆ وت (گوت) ؟ | من قال لك هذا ؟ |
| ئەو ئافرەتە کێیە ؟ | من تلك السيدة ؟ |
| ئەمە چەند دەخایەنێت ؟ | كم يستغرق هذا ؟ |
| کەی یەکتری ببینین ؟ | متى سنلتقي ؟ |
| لە کەیەوە چاوەڕوانیم دەکەیت ؟ | منذ متى تنتظرني ؟ |
| بۆچی خۆت بێزار دەکەیت ؟ | لماذا تزعج نفسك ؟ |
| ئەمەت لە کام لا دۆزییەوە ؟ | اين وجدت هذا ؟ |
| ئایا دەتوانم بڕۆم (بچم) ؟ | هل استطيع ان اذهب ؟ |
| هیوام خۆشیتە . | اتمنى لك السعادة . |

| | |
|---|---|
| ئەم کلاّوە هی کێ یە ؟ | لمن هذه القبعة ؟ |
| ناوم تۆماربکە . | سجل اسمي . |
| باوكو دایکم هاتن . | جاء امي وابي . |
| من فەرمانبەرم ، ئەو کرێکارە . | انا موظف ، هو عامل . |
| چوار برام هەیە . | لدي اربعة اخوة . |
| بەبێ سوود قسەی کرد . | تكلم بدون جدوى . |
| بە شێوەیەکی گشتی . | بصورة عامة . |
| بارانەکە کۆتایی پێ هات | لقد انتهى المطر . |
| دایکم دوێنێ گەیشت . | لقد وصلت امي البارحة . |
| تکایە من ببە بۆ سینەما . | رجاءً خذني الى السينما |
| بەداخەوە هەموو جێگاکان گیراون | للاسف كل الاماكن محجوزة. |
| ئایا ئەم پاسە دەچێت بۆ ناو شار ؟ | هل يذهب هذا الباص الى داخل المدينة |
| ئایا مۆڵەتی لێخوڕینت هەیە ؟ | هل لديك رخصة السياقة ؟ |
| نزیکترین مزگەوت دەکەوێتە کام لا ؟ | اين يقع اقرب جامع ؟ |

| | |
|---|---|
| نمرەی تەلیفۆنەکەت چەندە ؟ | ماهو رقم هاتفك ؟ |
| دەبێت چەند دینار بە تۆ بدەم؟ | كم دينار يجب ان ادفع لك ؟ |
| تاکەی مۆزەخانەکە بەکراوەیی دەمێنێتەوە ؟ | الى متى يظل المتحف مفتوحاً |
| بۆچی وەڵامی پرسیارەکەم نادەیتەوە ؟ | لماذا لم تجب على سؤالي ؟ |
| لە کام لاو کەی ئەمەت گوێ لێ بووە ؟ | اين ومتى سمعت هذا ؟ |
| ئەمڕۆ چ بەروارێکە ؟ | ماهو تأريخ اليوم ؟ |
| پاش دوو ساڵی تر خوێندنەکەی تەواودەکات . | سينتهي دراسته بعد عامين. |
| ئەو هەمیشە سەری قاڵە . | انه مشغول دائما . |
| زۆربەی ئیشەکانی جێبەجێ کرد . | نفذ معظم عمله . |
| پیاوەتی بکە پێم بڵێ . | من فضلك قل لي . |
| تکات لێ دەکە بۆ منی بهێنە . | ارجوك اجلب لي . |
| ئایا لێرەدا کەسێك هەیە بە زمانی کوردی قسەبکات ؟ | هل من يتكلم باللغة الكردية هنا ؟ |
| تکایە بە هێواشی قسەبکە . | تكلم ببطئ رجاءً |
| ماوەم بەدەستەوە نییە چونکە سەرم قاڵە . | ليس لدي وقت لانني مشغول |

## ڕاهێنانی (١)

ئەم ڕستانەی لای خوارەوە بگۆڕە بۆ زمانی کوردی :

١- انتم رجال الغد .

٢- فُتحَ الباب .

٣- ركِبَ علي الحصان .

٤- شربَ الولدانِ اللبنَ .

٥- ما زالَ الحر شديد .

٦- قم احتراماً لاستاذك .

٧- اختفى الولدُ وراء الشجرة .

٨- النمرُ شرسُ .

٩- اين تسافر اسافر معك .

١٠- في الحقل عشرون بقرة .

١١- اصبح الكسلان بالحيرة .

١٢- جاء المدرس فوقف التلاميذ .

١٣- وقف الجنود حتى القائد .

١٤- هل يذوب الحديد في النار .

١٥- فهِم التلميذُ الدرس .

١٦- افهَم الاستاذ التلميذ .

١٧- رفع الجندي الراية .

١٨- اكل الثعلبُ الدجاجة .

١٩- حمل الحمالُ الحطبَ .

٢٠- انتم تفهمون الدرسَ .

٢١- لاتقل إن العمل شاق .

٢٢- الحركة تقوي العضلات .

٢٣- اكلَ الفأرُ الجُبن .

٢٤- وقفت امام المرآة .

٢٥- جلَستُ مع صديقي لحظة .

٢٦- شكر الولد أمه .

## ڕاهێنانی (٢)

**ئەم ڕستانەی لای خوارەوە بگۆڕە بۆ زمانی عەرەبی :**

١- لە کانگای دڵمەوە .

٢- بەبۆنەی ساڵی نوێ پیرۆز باییت لێ دەکەم .

٣- ئەمە ماوەیەکی زۆرە ئاتبیم .

٤- سوپاس ناتوانم لێرە بمێنمەوە .

٥- بەداخەوە من دەمەوێت بڕۆم ، بەیارمەتیت .

٦- بۆ دەتەوێت بڕۆیت ؟

٧- چونکە گەلێك کارم هەیە ، سەرم قاڵە .

٨- ئەتوانم سبەینێ بتانبینم ؟

٩- کەی دەتوانم بتبینم ؟

١٠- ئەم فۆرمە پڕبکەرەوە .

١١- تا ئێستا بۆ ئەم وڵاتە گەشتتان کردووە ؟

١٢- نەخێر ئەمە یەکەم جارە .

١٣- ئێمە ئێستا لە کوێین ؟ ناوی ئەم شەقامە چی‌یە ؟

## ڕاهێنانی ( ٣ )

**ڕستەکانی لای خوارەوە بەم وشانە (کاری گەری ، دڵسۆز ، من ، بەناوبانگ ، پیشە ، ئامۆزا ، ساڵ ، ئەوان ، هات ، چاك ، دەستەکانتان ، نەخۆشەکان ، چوو ، ئایندە ) تەواوبکە :**

١ ـ باوکی ئەحمە ئەندازیارێکی --------ـە .

٢ ـ ئەو بۆ دیداری -------- بۆ خەستەخانە -------- .

٣ ـ پشووبدە تاوەکو تەندروستیت -------- بێتەوە .

٤ ـ ئەگەر وەڵامەکە دەزانن -------- بەرزبکەنەوە .

٥ ـ لە راستیدا -------- زۆر زیرەکن .

٦ ـ -------- پزیشکەکان چارەسەرکردنی --------ـە .

٧ ـ باوکی ئازادی --------م ئەندازیارێکی لێهاتووە .

٨ ـ لە ساڵی -------- دا فەرهەنگ چاپ دەکەین .

٩ ـ قوتابخانەکەمان هەموو -------- یك ئاهەنگ دەگێڕێت .

١٠ ـ ئایا دەرمانەکە --------ێکی هەبوو .

## ڕاهێنانی (٤)

نیشانەی ( ✓ ) بەرامبەر ڕستە ڕاستەکان دابنێ و نیشانەی (✗ ) یش بەرامبەر ڕستە هەڵەکاندا دابنێو هەڵەکان ڕاستبکەرەوە :

١– من هەزارو حەوت سەد دینارت پێیە .

٢– لە ساڵی دوو هەزارو هەژدەدا جامی جیهان دەستی پێکرد .

٣– ئەگەر ئیش نەکەیت گوزەرانت تاڵ دەبێت .

٤– باوکی نەیهێلا ئەو بۆ سینەما بڕۆن .

٥– ئێمە دوێنێ کۆبوونەوەتان هەبوو .

٦– من و هاوڕێکەم ڕۆشتن بۆ بازار .

٧– ئایا دەتوانیت لەم فەرهەنگەدا وشەی سێو پەیدابکەم ؟

٨– تکایە تۆ دەتوانیت ئەم گۆڤارە بدە بە نازدار .

٩– من زۆر جار نامەت بۆ تۆ نووسی بەڵام هیچ وەڵامێکم دەستان نەکەوت .

١٠– ئەو وتی من حەزناکەیت لە گۆشتی ماسی .

## ئەمانەی لای خوارەوە چەند پەندێکی کوردیی ڕەسەنن :

ـ ئاگر نەگەیشتە جێگا ، دوکەڵی لێ هەڵسا :

واتە :لە ژێر ئەم کاسەیە شتی تری تێدایەو بۆ فرۆفێڵ بەکاردێت.

ـ ئەگەر زەمانە هێناتیە پێکەنین ، وریابە نەتگریێنێ ساڵێك :

واتە: ئەگەر تووشی خۆشیەك بووی ، یاخی مەبەو لە خۆت بایی مەبە ، با تووشی ناخۆشی یەك نەبیت کە خۆشی یەکەت لە بیر بباتەوە .

ـ پارەت هەبێ کەس نالێت کوڕی کێی :

واتە : پارە عەیبوعارت دادەپۆشێو کەسی ناکەس بەچەش دەکا بە کەسیوکەس لە ئەسڵورەچەڵەکت ناپرسێ کەموکوڕیەکانیشت دادەپۆشێ ، خەڵك لە دەورت کۆدەبێتەوە .

ـ چاوی برسی بە خۆڵ نەبێ چاوی تێر نابێ :

واتە : تەماحکار بەمردن نەبێ چاوی تێر نابێ .

ـ خوا دەردی داوەو دەرمانیشی داوە :

واتە : ئەبێ لە کاتێکدا کە تووشی نەخۆشی دەبی بەدوای چارەسە بگەڕێیت .

ـ ئەگەر سەرت نایێشێ پەڕۆی تێ مەئاڵێنە :

واتە : ئەگەر كارو كێشەیەك پەیوەندیی بە تۆوە نەبوو خۆتی تێ مەئاڵێنە .

ـ فێری ڕۆیین بە ، ئنجا دەست بكە بە ڕاكردن :

واتە : هەرچاكەیەكت كرد پێ بەرەسەر تا دوایی .

ـ كانی یەك ئاوت لێ خواردەوە ، بەردی تێ فڕێ مەرد :

واتە : هەرچی شتێك كە بەهرەت لێ وەرگرت لەقەی لێ مەدە .

ـ كوچك تا نەجوڵێ ، سەنگینە :

واتە : هەموو كەسێك لە شوێنی خۆی بەرێزە .

ـ گەر لە بێشە شێر نەما ، گورگو مام ڕێوی ئەكەونە سەما :

واتە : ئەمە دەستوورێكی ڕاستودروستە ، خوا نیشانی هیچ گەلێكی نەدا چونكە ئەمە سەرەتای مردنیەتی .

ـ لە چۆڵو بیابانا بی لەگەڵ زۆرداردا ، لەوە باشترە كە ڕۆژ بكەیتەوە لە كۆشكا لەگەڵ نەزانا :

واتە : زۆر دووربینو پارێزگارە .

– دەوڵەمەندی بە دڵە نەك بە ماڵ ،گەورەیی بە عەقڵە نەك بە ساڵ:

دەوڵەمەند کەسێکە ، کە دڵی فەراوان بێ ، با نەشی بێ ، هەژاریش کەسێکە ، کە ڕووناکی لە دڵی دا نەبێ ، با زۆریشی ببێ هەر وەك گەورە ئەوەیە کە ژیر بێ، با بە تەمەنیش مندال بێ، بچووك ئەوەیە کە ژیر نەبێ با تەمنیشی زۆر نەبێ .

– دوای کلاوی بابردوو کەوتووە :

بە یەکێك دەوترێ دوای کارێکی وا کەوتووبێ کە هەرگیز بۆی نەبێ .

– ڕازت لای یەکێك دانێ و پرست لای هەزار :

واتە: نهێنی دڵی خۆت بەکەس مەڵێ ، بەڵام بۆ هەموو کارێك تا دەتوانیت ، پرس بکەو ڕاوێژ لەگەڵ دۆستدا بکە .

– ڕووبەڕوو دەم چەور ، پاشملە دەم تەور :

لە ڕووتدا دۆست و لە پاشملە دوژمنە .

– ڕێویەکی گەڕۆك ، لە شێرێکی نوستوو چاکترە :

واتە: چونکە یەکەم شتێکی هەر لە دەست دێ ، بەڵام دووەم هیچی لە دەست نایەت .

– سەد ساڵ بکەیت بێگانە پەرستی ، دوایی هەر دێنێت نشوستی :

چونکە بێگانە هەر قازانجی خۆی و پاشکەوتنی تۆی دەوێ .

- سەرێ بەدەستی خۆت نەیخورێنی، خوروی ناشکێ:

چونکە کەس وەکو خۆت شارەزای دەردی تۆ نی یە، واتە هەموو کەس دەبێ خۆی دەرمانی دەردی خۆی بکات.

- سەری بێ سەودا ناوەستێ:

بە یەکێك دەوترێت کە بە بێ ئیش وکارو هەوڵ و تەقەلا دانەنیشێ.

- سەرێك لەناو سەرانا نەبێ بەر شەقان کەوێ:

واتە: ئەوکەسەی دوورەپەرێز بێ لە خزمەتی کۆمەڵەو گەل بۆ نەمان چاکە.

- شانم کردووە کۆمە، هەڵم گرتووە لۆمە:

واتە: بە یەکێك دەوترێ، کە لۆمەیەك ڕووی کردبێ و گوێی نەداتێ.

- شەق دەزانێ قۆناغ لە کوێیە:

بە یەکێك دەوترێ، کە پێویستێکی سەرشانی بەجێ نەهێنابێ و ئێستا بە زۆر پێی بکرێت.

- شوانی ناپاك لە گورگ خرابترە:

چونکە گورگەکە مەڕێ دەخواو ئەڕوا، بەلام شوانی ناپاك هەموو ڕۆژ دەستی ناپاکی ئیش دەکات.

– فێرکەران فێریان مەکە ، کە فێریان ئەکەیت تێریان بکە :

واتە: هەر چاکەیەکت کرد بی بەرەسەر تا دوایی .

– قازانج سەری مایەی خوارد :

واتە: بۆ قازانج چووم کە چی دەست مایەکەشم دانا .

– قسە یا لە شێت ببیسە یان لە منداڵ :

کەواتە لە قسەی باشدا، دریغی مەکە ، یاخۆ بە یەکێك دەوترێ کە قسەی هاشە هوشە زۆر بکات .

– کاتێك جەنگیت ئاشتیت لە بیربێ :

واتە: بەشی ئاشتی تیا بێڵەرەوە .

– کە پیاو زۆری وت ، چاکیش ئەڵی و خراپیش ئەڵی :

واتە: کەوابوو زۆر قسە مەکە باخراپ بە دەمتدا نەیەت .

– کەس لە پرێ ، نابێ بەکورێ :

واتە: هەموو ئادەمی یەك لە پێشەوە هیچ نازانێ ، لە پاشدا بەررەبەرە گەورەدە بێت و ژیردەبێ تا دەبێ بە مرۆڤێکی تەواو .

– کونە مشکی لێ بووە بە قەیسەری :

یەکێك دەوترێت لە ترساندا نەزانێ چی بکات و چۆن خۆی بشارێتەوە

– گەورە ئاو ئەڕێژێ و بچووك پێی تێ ئەخا :

واتە: کە وابوو ئەی گەورە ، ئاوی باش بڕێژە بۆ بچووك ، هەمیشە سەرمەشقی چاك بە بۆی .

– گوریس لە کوێ پسا لەوێ گرێی بدەرەوە :

واتە: تووشی هەر مەسرفێك بوویت بە قەد پێویست پارە خەرج کە نەکەیت زیاتر لەوە خەرج بکەیت

– گوێز بە ژمارە ، مایەی خاوەنی دیارە :

بەلام بە گۆترە نە مایە دیارەو نە قازانج .

– لە ئاوی مەندولە پیاوی مۆن بترسە :

چونکە نازانیت چی لە دەرووندایە .

– لەسەرەوە شۆخ لە ژێرەوە پەڕۆ :

واتە: بە یەکێك ئەوتری لە سەرەوە کالای جوان و لە ژێرەوە کالای دڕاوی لە بەردابێ یا بە دیمەن لە پێستی مەڕو بە دڵیش گورگ بێ.

# ئەمانە چەند کردارێکی ڕابوردوون کە زۆر بەکاردەهێنرێن

| کوردی | عەرەبی |
|---|---|
| دای هێنا | إخترعَ |
| پاڕایەوە | إبتهلَ ، توسلَ |
| شادمانی کرد | أبهجَ ، أفرحَ |
| تاوانباری کرد | إتهمَ |
| وروژاندی | أثارَ |
| ناچاری کرد | اجبرَ |
| پەڕی یەوە | عبرَ |
| نارەزایی دەربڕی | إحتجَ |
| قۆڵ بەستی کرد | إعتقلَ |
| هێنای | أحضرَ ، جلَبَ |
| خەمباری کرد | أحزنَ |
| بووژاندی یەوە | أنعشَ |
| هەڵی بژارد | اختارَ |
| وەری گرت | أخذَ |
| کورتی کردەوە | إختصرَ |
| شارایەوە | إختفى |
| دەری هاوێشت | أخرجَ |
| درۆی هەڵبەست | إفترى |
| هەڵەی کرد | أخطأَ |
| دوڕاندی | فشل ، خسرَ |
| چۆڵی کرد | اخلى |
| تۆمەتباری کرد | ادانَ ، اتهمَ |
| دەرکی پێ کرد | ادركَ |
| خووی پێوە گرت | ادمنَ |
| سەرسامی کرد | ادهشَ ، اذهلَ |
| هێوری کردەوە | اراحَ |
| شڵەژانی | اربكَ |
| گومانی لێکرد | ارتاب ، شكَّ |
| لەری یەوە | ارتجَ ، اهتزَ |
| تاوانی کرد | اقترفَ ، ارتكبَ |
| خاوی کردەوە ، شلی کردەوە | ارخى |
| ناردی | ارسلَ ، بعثَ |
| ڕابەری کرد | ارشدَ |
| قایلی کرد | ارضى ، اقنعَ |
| لای برد | ازاحَ ، ازالَ |

| | |
|---|---|
| بە کرێی گرت | استأجرَ |
| دووری خستەوە ، لای برد | استبعدَ |
| وەڵامی دایەوە | اجابَ |
| بەکاری هێنا | استعملَ |
| پەسەندی کرد | استحسنَ |
| بانگی کرد | استدعى |
| گەڕانی یەوە | استرجعَ ، استبدَّ |
| بەدیلی گرت | أسَرَ |
| دای مەزراند | اسسَ |
| دەست بەرداری کرد | استغنى عن |
| بەردەوام بوو | استمرَ |
| لە بەری گرتەوە | استنسخَ |
| هەڵی مژی | استنشقَ |
| پەلەی کرد | اسرعَ ، استعجلَ |
| بێ دەنگی کرد | اسكتَ |
| بەردەوام بوو | ثابرَ ، واظبَ |
| ورووژا | ثابرَ |
| یاخی بوو | تمرّدَ |
| هەڵقوڵی | تفجَّرَ |

| | |
|---|---|
| جێگری کرد | ثبتَ ، رسخَ |
| سەلماندی | ثبّتَ |
| خەست بووەوە | ثخُنَ ، تكثّفَ |
| چەنەبازیی کرد | ثرثرَ |
| بەخشی | سامحَ |
| لێی خوڕی | ساقَ ، قاد السيارة |
| ئاماژەی کرد | اشارَ |
| ڕاوی کرد | اصطادَ |
| گوێی گرت | اصغى |
| چاکسازی کرد | اصلحَ |
| کومی کرد ، بزری کرد | اضاعَ |
| زیادی کرد | اضافَ |
| بێزاری کرد | اضجَرَ |
| لاوازی کرد | اضعفَ |
| پۆزشی هێنایەوە | اعتذرَ |
| بانگەشەی کرد | اعلنَ ، صرحَ |
| خۆی شۆرد | اغتسَلَ |
| تووڕەی کرد | اغضبَ |
| وای دانا | افترضَ |

| | |
|---|---|
| افرزَ | جیای کردەوە |
| افقرَ | هەژاری کرد |
| حصلَ ، کسبَ | دەستی کەوت |
| افزعَ ، خوّفَ | تۆقاندی |
| اکتشفَ | دۆزی یەوە |
| اکّدَ | جەختی کرد |
| التصقَ | پێوەی نووساند |
| التمسَ ، طلبَ | داوای کرد ، پاڕایەوە |
| الغیٰ | هەڵی وەشاندەوە |
| الهبَ | گڕی گرت |
| امتدحَ | ستایشی کرد |
| امتزجَ | تێکەڵی کرد |
| امتلكَ | هەی بوو |
| امرَ | فەرمانی دا |
| امّمَ | خۆماڵیی کرد |
| أثارَ | دای گیرساند |
| انتشرَ | بڵاوبووەوە |
| انتهیٰ | کۆتایی پێ هات |
| انجرَفَ | ڕامالڕا |
| انجزَ | جێ بەجێ کرا |

| | |
|---|---|
| انحرفَ ، مالَ | لاربووەوە |
| انخرطَ | خۆی تێ کوتا |
| انسحبَ | پاشگەزبووەوە |
| انقلبَ | هەڵگەڕایەوە |
| انکرَ | نکۆڵی کرد |
| انکمشَ | گرژبووەوە |
| اهانَ | ڕیسوای کرد |
| اهملَ | فەرامۆشی کرد |
| خدعَ | فێڵی کرد |
| ساندَ ، ایّدَ | پاڵپشتی دا |
| ایقضَ | هەڵی ساند |
| جادلَ | مشت و مڕی کرد |
| جاعَ | برسی بوو |
| جدّدَ | تازەی کردەوە |
| جذفَ | سەوڵی لێدا |
| سالَ ، جرٰی | لێشاوەی کرد ، ڕۆی |
| جرَحَ | بریندار بوو |
| جسّدَ | بەرجەستەی کرد |
| جففَ | وشکی کردەوە |
| جفلَ | ڕاچەڵەکی |

| | |
|---|---|
| دانیشت | جَلسَ |
| کۆی کردەوە | جمعَ |
| جوانی کرد، ڕازاندیەوە | جمّلَ |
| جەنگیا | حاربَ |
| گەمارۆی دا | حاصرَ |
| چنی ، ڕێسای | حاكَ |
| دەوروخولی دا | حامَ |
| خۆشی ویست | حبّ ، عشقَ ، هوٰی |
| هانی دا | حثّ ، حفزَ ، حرّضَ |
| ڕووی دا | حدث |
| تەرخانی کرد | خصصَ |
| ترسانی ، وریای کردەوە | حّذرَ |
| سڕی یەوە ، لای دا | حذفَ |
| ئازادی کرد | حررَ |
| ژماردی | حسبَ |
| لێی داشکاند | حسمَ ، خصمَ |
| تێی ئاخنی ، پڕی کرد | حشا ، ملاَ |
| چاڵی کەند | حفرَ |
| بەرزی کردەوە | رفعَ |

| | |
|---|---|
| شریقەی لێدا | حقَنَ |
| جوولا | حرّكَ |
| قەدەغەی کرد | منعَ |
| فەرمانڕەوایی کرد | حَكمَ (مارس السلطة) |
| سوێندی خوارد | حلفَ ، أقسمَ |
| باڵی گرتەوە | طارَ ، حلَقَ |
| ترازا | حلّ ، فكّ |
| تووایەوە | انصهرَ ، حلّ |
| خەوی بینی | حلُمَ |
| پاراستی | حمىٰ ، وقى |
| برژاندی | حمّصَ |
| هەڵی گرت | حمَلَ |
| گۆڕی | حوّرَ |
| پەیوەندی کرد | خابرَ |
| نانی کرد | خبزَ |
| تەواوی کرد | ختمَ ، انهىٰ |
| گزی کرد | غشّ |
| وێران بوو | خربَ |
| دەرچوو | خرَجَ |

| | |
|---|---|
| کەم بووەوە | نقصَ |
| دای کەند | خلعَ |
| دامرکایەوە | خمدَ |
| قەبلاندی | خمّنَ |
| خنکا | خنقَ |
| درووی | خيطَ ، خاطَ |
| پێچی کردەوە | دارَ ، استدارَ |
| سووڕایەوە | دارَ ، دوّرَ |
| هاڕی ، کوتای | داسَ |
| بەرگری کرد | دافعَ |
| شۆخی کرد ، گاڵتەی کرد | داعبَ ، لاعبَ |
| مایەوە | بقي ، دامَ |
| بەزانی | هزمَ ، دحرَ |
| تل بووەوە | دحرجَ |
| بەدرۆی خستەوە | دَحضَ ، فنّدَ |
| چووەژوورەوە | دخلَ |
| دووکەڵی کرد | دخّنَ |
| مەشقی کرد | درّبَ ، تدربَ |
| تەڕبوو | رطبَ |
| ڕەتی کردەوە | رفضَ |
| سواربوو | ركبَ |

| | |
|---|---|
| خوێندی | درسَ |
| فێربوو | تعلّمَ |
| کردی یەوە | فتحَ |
| پاڵی پێوەنا | دفعَ |
| بینی | رأىٰ |
| سەرکردارییەتی کرد | رأسَ ، ترأسَ |
| چاودێری کرد | راقبَ |
| گرەوی کرد | راهنَ |
| بەخێوی کرد | تبنّى |
| ڕۆشنبیری کرد | ثقفَ |
| بردی یەوە | فازَ ، ربحَ |
| بەستی | ربطَ |
| ڕێکی خست | رتبَ |
| پینەی کرد | رتقَ |
| ڕۆشت | رحلَ ، غادرَ |
| بەرتیلی دا | رشا |
| پاڵاوتی | رشحَ |
| شیری پێدا | رضعَ |

# ناوەڕۆك

| لاپەڕە | بابەت |
|---|---|


پێشەكی ........................................ ٥
الالفباء الكوردية ........................................ ٧
چەند ڕاهێنانێكی گشتی ........................................ ١١
وانەی یەكەم : پیتی (ه ـ ـە ، ئـ ، پ ، ب ) ........................................ ١٥
واتای وشەكانی وانەی یەكەم ........................................ ٢٢
وانەی دووەم : پیتی : چ ، ج ، ڕ ، ر ........................................ ٢٩
واتای وشەكانی وانەی دووەم ........................................ ٣٦
وانەی سێیەم : پیتی : ژ ،گ ، ك ، ڵ ،ل ........................................ ٤٤
واتای وشە كانی وانەی سێیەم ........................................ ٥٣
وانەی چوارەم : پیتی : ۆ ، و ، ێ ، ی ........................................ ٦١
واتای وشەكانی وانەی چوارەم ........................................ ٦٨
وانەی پێنجەم : چەند ڕستەیەكی جۆراوجۆر (ڕاناوی دەست نیشان كردن ........................................ ٧٦
وانمەی شەشەم : چەند ڕستەیەكی جۆراوجۆر (كردار ) ........................................ ٧٩
واتای وشەكانی وانەی پێنجەم و شەشەم ........................................ ٨٠
بەشی ڕێزمان ........................................ ٨١
وانەی یەكەم ( جێناوی كەسی جودا) ........................................ ٨٣
وانەی دووەم (جێناوی كەسی لكاو) ........................................ ٩٠
وانەی سێیەم (ناو لە ڕووی ژمارەوە) ........................................ ٩٨
وانەی چوارەم (ناو لە ڕووی ناسینەوە) ........................................ ١٠٢
وانەی پێنجەم(ئامرازی پرس) ........................................ ١٠٦
وانەی شەشەم (دەمەكانی كردار / كرداری ڕابوردوو) ........................................ ١٠٩
وانەی حەوتەم (كرداری ڕانەبوردوو) ........................................ ١١٤
وانەی هەشتەم (كرداری داخوازی) ........................................ ١١٨

وانەی نۆیەم ( ئاوەڵکردار ) ........................................ ١٢١

**گفتوکۆ** ........................................ ١٢٧

وانەی یەکەم (کات) ........................................ ١٢٩

وانەی دووەم (یەکترناسین) ........................................ ١٣٢

وانەی سێیەم (لە بازاڕدا) ........................................ ١٣٥

وانەی چوارەم (شۆفێرو مۆڵەتی لێخوڕین) ........................................ ١٣٩

وانەی پێنجەم (چەند ڕستەیەکی جۆراوجۆر) ........................................ ١٤١

**بەشی وێژە** ........................................ ١٤٥

وانەی یەکەم (فایەق بێکەس) ........................................ ١٤٧

وانەی دووەم (قانیع) ........................................ ١٥١

وانەی سێیەم (پیرەمێرد) ........................................ ١٥٥

**بەشی خوێندنەوە** ........................................ ١٥٩

وانەی یەکەم (ئەرکی سەرشانی ئێوە بەرامبەر (باوكو دایکتان چی یە ) ........................................ ١٦١

وانەی دووەم (شاری سلێمانی شاری هەڵمەتو قوربانی) ........................................ ١٦٦

وانەی سێیەم (زانای گەورەی کورد توفیق وەهبی) ........................................ ١٧١

وانەی چوارەم (مەلا عبدولکەریمی مودەڕیس) ........................................ ١٧٦

**بەشی وەرگێڕان** ........................................ ١٨١

خۆڕاهاتن لەسەر وەرگێڕانو چۆنێتی داڕشتنی ........................................ ١٨٣

چەند پەندێکی کوردیی ڕەسەن ........................................ ١٩٦

چەند کردارێکی ڕابوردووکە زۆر بەکاردە هێنرێن ........................................ ٢٠٢

ناوەڕۆك ........................................ ٢٠٧